## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: زایەڵەی زیندان

بابەت : هۆنراوە

نووسینی : فرهاد محمد مصطفی

چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلات - هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی ( ٤٦٤ )ی ساڵی( ٢٠١٧ )ی پێدراوە

# پێشکەشە بە :

● ڕۆحـی دایـك و بـاوكی خۆشەویـستم كـە ئێـستا لـەژێر ڕەحمەتی خوای بە بەزەیی لەنێو گۆڕدان .

● هەموو بـراو خوشـكێكی بـاوەڕدارم كـە لەهـەر ووتـەیـەك واتـایەكی بـاش وەردەگرن تـا لەبەرچـاو ڕوونیـەكا شـەوە زەنگی تەمەنیان ببڕن .

●ئەوكەسانەی تا ئێـستا لەزینـدانی گونـاهو سەرپێـچی دا ماون و حەز بەڕزگاربوون دەكەن .

بسم اللهِ الرحمنِ الرَحيم

## پێشەکی

إنَ الحمدَللهِ نحمدهُ ونَستعينهُ ونسغفرهُ، ونَعوذُ باللهِ مِن شرور أنفسنا ومن سيئاتِ أعمالنا، من يهده اللهُ فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي لـه، أشهدُ أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له، وأشهدُ أن محمداً عبـدهُ ورسـوله - أما بعد :

سـەرەتای هـەرکارێك لەبیرۆکەیەکەوە دەسـت پـێ دەکـات بـەڵام بەقەد بـوونی بیرۆکـەو بەرنامەکـە پـێش ئەنجامـدانی کارەکـە، دڵسۆزی تێیدا گرنگە، چونکە بابای ژیر ژیان وەك دەریایەکی پڕ مەترسی سەیر دەکات و بەرنامە دادەڕێژێت بۆ چۆنیەتی گەیاندنی کەشتی تەمەنی بـە کەنارێکی ئارامی دەریاو ناوچەکە، هەڵبـەت کـەناراوای نائـارامیش زۆرن کەچەندین جـەردەی دووپـێ و دڕنـدەی چوارپـێ لـە بۆسـەدا خۆیـان بـۆ ئـەم ئـادەمیزادە لەمـەڵاس دانـاوە، هـەروەکو خـوای زانـا دەفـەرمووێ :

﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيّٗا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرٗا ﴿٤٥﴾﴾ النساء : ٤٥

واتـە : خـودا زانایـە بـە دوژمنـەکانتان، هـەر ئـەویش بەسـسە کـە پاڵپشت و سەرخەرتان بێت بەسەریاندا .

کەواتە شارەزایی بەدەوروبەر پێویستە تا بتوانی بەبەرچاو ڕوونـی هەنگاو هەڵێنی، ئەگینا لەکاتێکدا کەتۆ بۆ ڕاوکردنی چاکە بـەم خاکـەدا دەڕۆیی و گوزەردەکەی، لەلایەکەوە دەبیتە نێچیرو ڕاودەکرێی !

لەهـەموو دوژمنـەکانیش دڕنـدەتر شـەیتانە کەچـاوی بڕیوەتـە بـەنرخترین شـتی تـۆ کـە باوەڕەکەتـەو تـا مـردن لەهـەموو دەرفـەت و هەڵێکدا سوود لەبێ ئاگایی و سەرقاڵی تۆ وەردەگرێت تـا هێرشـی کـت و پڕی بهێنێتە سەرت، هەروەکو پێغەمبەری دڵسۆز(صلى الله عليـه وسـلم) فەرموویەتی :{الشيطانُ ذئبُ الإنسان}رواه احمد في المسند(٢٢٣/٥ و ٢٤٣) وأبو نعيم في الحلية (٢٤٧/٢) .واتە : شەیتان گورگی ئادەمیزادە .

هەروەك شوێن كەوتەكانیشی هەروا فێركردووە كە لەهەر هەڵێكدا دەرفەت وەرگرن بۆ هێرش كردنە سەر موسڵمانان، هەروەكو دەفەرمووێ: ﴿ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً ﴾النساء ١٠٢

واتـه : بـێ بـاوەڕان زۆر بـەهیوای ئـەوەن كـەئێوە بـێ ئاگـابن لەچەكەكانتان و كەل و پەلەكانتان تا هێرشتان بكەنە سەرو پـەلامارتان دەن و بەیەكجارەكی لەناوتان بەرن .

كەواتـە ئاگـاداری و ئاگاداركردنـەوەی موسـڵمانان لـەداوو پیلانـی شەیتان و گەلە گورگەكەی ئەرك و پێویستیەكی سەرشانی هەركەسێكە كە هەسـت بـەبوونی مەترسـی بكـات لەسـەر گـەنج و لاوانـی موسـڵمان، هەرچەندە من شاعیر نیم بەڵام ویستم بەهۆنراوەی سادە خاڵێك بخەمە سـەر ئـەو ووشـەیەی سوودێك بەموسڵمانان دەگەیـەنێت بـەو ئومێـدەی ببێتە مایەی دوعای خێری ئێوەی بەڕێز بۆ بەندەو چاكەیەكی نـەبڕاوە بۆ دایك و باوكی كۆچ كردووم .

{رَبنا اغفرلي ولِوالِدَيَ وَلِلمؤمنينَ يومَ يَقُومُ الحِساب}

امين

{وَصَلي اللهم على نبينا محمد وعلى الهِ وصحبهِ وسلَم تسليماً}

فرهاد محمد مصطفى

زیندانی هەولێر – جمعه

٣/رجب/١٤٣٨

٢٠١٧/٣/٣١

# بەکورتی کەمێك لەوەی لەبیرم مایە

ئەمــــە مـــــشتێکە، لەخــــەرمانی عومــــرم
لــــەکاتی زیندانیمـــــدا، بــــەواقع ڕوویدایــــە

چیرۆکــــە، ڕۆمــــان، بەهــــەر ناوێکــــە
گرنگــــە بۆتــــۆ، چەنــــد وانــــەی تێــــدایە

کــــەمن بەهرەمەنــــدبووم، لــــەم ژینــــە تاڵــــە
تەجروبــــە شــــەکرە، بــــۆ شیریــــنی چایــــە

بەتەقــــدیری خــــودا، شــــەوێك هاتــــمە دەر
زســــتانە، مــــانگی یــــەك، کــــەمێك سەرمایــــە

چوومــــە دوکانێــــك، لــــەبەری ئــــەوبەر
هــــەم دراوسێمانــــەو، هــــەم وەك بــــرایە

(١٢)ی شەوالــــە، بیــــستی کۆچیــــە(*)
هــــەورە، غــــەمــــبارم، تاریــــکی شەومایــــە

(*) ساڵی (١٤٢٠)ی کۆچی بەرامبەر (٢٠٠٠) میلادی

دوای نیو کاتژمێر، لەوێ هاتمەدەر
بێ ئاگا لەوەی، بۆسە دانرایە

بیستم کەسێ، بانگ ئەکا دیاربوو
هەواڵی کەسێکی، ئازیزی هێنایە

هەواڵدەر بەجۆرێ، دڵی خۆش کردم
وام زانی ئێستا، دەرگای واڵایە

لەناکاو لولەی، چەك خرا سەرسەرم
دووسەیارەش لەوێ، چەکداری تێدایە

هەر زوو دوو لەوان، لەپڕ، تاویانـدام
سەر بەرەو گاعی، دەستم سوڕایە

بە (أمَن یُجیبُ) ڕووم کردە خودا
بە ئیشارەتێ گوترا، خوا لەگەڵتایە

سەیارە دەعمی کرد، یەکسەر کوژاوە
کوژاوە دەڵێی چەند ساڵە وەستایە

ناچار خرامەنێو، سەیارەیەکی دیکە
تا وەستا لەژێر، تارمایی بینایە

خرامە ژوورێکی، تاریک و تەنها
بەدەنگی زانیم، کەسێ لەگەڵمایە

کە ڕۆژ بۆوە، بینیم گەنجێکە
ئەشکەنجە دراوەو، سست هەڵگەڕایە

پرسیارێکی هەبوو، بەسەد جۆر دەیکرد
مەبەستی ئەوەبوو، ئومێدمان مایە ؟

سێ شەوو دوو ڕۆژ، هەروا مامەوە
کەسم نەبینی و کەس بەلام نایە

لە ڕۆژی جومعە، بردرامە تحقیق
وا سەدای بانگ و ووتاری مەلایە

بۆ دارو کێبل، پشتیان ڕووت کردم
دەست لەدواوەو چاوم بەسترایە

وێڕای ئەشکەنجەو، فشارو هەڕەشە
وێردی سەرزارم توحیدی (الله) یە

هێنرامەوە ژوورەکەم، بینیم هاوڕێکەم
بەترس و پەرۆش و لەچاوەڕێمدایە

ڕووناکی ژوورەکەم، تەنها گڵۆپێك بوو
پێکردنی تەنها، لەدەستی جەرەسدایە

لەکاتی ژەمەکان، بە ئەنقەست دەیکوژاند
دەمانووت پێیکە، دەیوت کارەبا نەمایە

ناچار بەگڵۆپی، سەعاتی دەستی
خواردنێکمان دەخوارد کە پێمان درایە

لەدوا چەند ڕۆژێ، لەکاتی شەوێ
بردرامە لقی چار، چارەم ڕێگایە

بەتەنها نەبووم، برایەکی تریش بوو
سەیارە لایداو لەسەر خۆڵە تایە

ئەویان بردە خوار، پاشان ووتیانە من
شایەتی بێنەو دەرفەتت نەمایە

پاشان بردمیانە، ژوورێکی یەك مەتری
دیوار بەخوێنەو زۆر ناو نوسرایە

لەڕۆژی چوارجار، سەر ئاومان هەبوو
چی بکەین چوارەم جار لێدانی تێدایە

کــــه خـــــواردن دەهـــــات، بـەزسـتـانـــــی ســــارد
پـیـیـــــان نــــــەدەدام، تـــــا ســـــارد نـەبـوایــــه

لــــەم زوورەشـــــم دەبیـــــنم، هاوڕێیـەکـــــم هــــەیە
جـاڵـجـاڵـۆکـەیـەکــــــەو بـەدیــــــوار نــووســــــایە

زیـــاتر لــەدوو هەفتـــەبوو، هـــیچ جوڵەیـــەکی نەبـــوو
کـاتێ کــه فـــووم لێ ی ئـــەکرد، دەجـولاو زانـــیم مایـــه

پـــەروەردگاری مـــەزنم، بــــەم مەخــــلوقەی لەگەڵـــم
وانــــەی ئـــــارامی زۆری، بــــەمنی هـــەژار بەخـــــشایە

لــــەدوای (٣٣) ڕۆژی وا، لــــەم شـــوێنەی کەمــــە هیـــوا
ئەوپارەیـــەش کـــەلام بـــوو، هــــەمووی لـــێم وەرگیرایــــه

پاشــــان بـردرایـــــنه بــــەردەم، صـــەلیبی ئەحمـــەر
کـەبـــــۆ بـیـنـیـنــــمان ، هەوڵێــــکی زۆریـــان دایـــــه

ووتیـــان بـــێ شـــك بـــزانن، لــــێره دەتـــان گـوازنـــــەوە
بۆهــــەرشوێنێك بتـــــان بەن،ئــــێمه هــــەواڵمان لایــــه

بـــەڵێ دوای چــــەند ڕۆژان، بـــۆ ئـاکــــرێ بـردرایـــــن
ووتــــیان ئـەوەهـاتیــــــن ئەشیـــــامان هێــــنایە

بەڵکو قورئانێک کە کورد لێ ی سەندین
صەلیب بۆی هێناین، فەزڵی خودایە

زیندانی ئاکری، زۆر بەناوبانگ بوو
کەهەموو شێوازی، ئەشکەنجەی تیایە

ناخۆشترین شوێن، کە ئێمە تێیداین
ژوورێکە بەدووکەڵ ڕەش هەڵگەڕایە

پەنجەرەی شکاوەو سەقفی تەقیوە
لەسەروو دڵۆپەو لەم لاوە بایە

پێشتر سەرئاوبوو، کرابوو بەزیندان
بەڵکو گۆڕێکەو زیندووی تێ کرایە

زیندووەکان ئێمەین، بێگانەو نامۆین
لەشاری خۆمان شوێنمان نەمایە

لەم ژوورەی ئێمەش، بەتەنها نەبووین
لەناو پەلکەنان مشکەکانی تیایە

تەنها دڵ خۆش بووین، بەپەرە سێلکەکان
کاتێ دمیانکرد زکری ئەم خوایە

لەم (٣٣) ڕۆژەی، ئەم ژینە تاڵە
لێدان و بێ ڕێزی زۆرمان پێ کرایە

ئینجا بۆ هەولێر، گەڕێنراینەوە
کەونە سجنەکە دەرگای واڵایە

ئەوەی نەمان بوو، خەونی هەمووان بوو
بە هاوین بەفرو بەزستان چایە

بەسگی برسیمان، دەلەرزین لەسەرمان
مەگەر لەخەونا تێرخواردن بوینایە

ژەم بۆ ئەو ژەم، چاوەڕێ هەردەم
بەڵکو ژەمێکیان خواردن زۆر بوایە

لەدوای تێپەڕبوونی، (٨) مانگ زەبوونی
بردراینە لای کەسێ کە حاکم قەزایە

ئینجا هاتینە خوارێ، بۆ قاعەی پێنجێ
لەوێ برسێتیمان تا ڕاددەیەك شکایە

(٩)مانگ ئینفرادی، تەواو لەخوا بەزیادبێ
ئێمە لەناو گۆڕێ بووین، ئێستا تۆزێك واڵایە

مواجەهـــەمان هـــەبوو، بـــەس لـــەدوای خـیـەڵك بـــوو
دەبـــوو لـــەدوای (٥) خولـــەك خواحـــافیزت كردایـــە

بەكارتـــۆن و بـــەجلد، مزگـــەوتم دروســـت دەكـــرد
هـــەروا سـەعاتـــی داری كـــە بـەتوتـــی ناســـرایە

وەرزشمـــان ئـــەنجام ئـــەدا، تـــا گۆشـــت ئێـــسك بەرنـــەدا
بـــــڕواداری بەهـــــێزیش خۆشەویـــــستی خودایـــــە

لەپاشـــی ســـێزدە جەلـــسە، مـــانگی یـــەك ڕۆژی ســـێزدە
لەلایـــەن حـــاكم رەئـــوف، حوكـــمان هەتـــا هەتایـــە

بردرایـــن لەبـــۆ محەتتـــە، كەوتینـــە دەستـــی شورتـــە
گەرچـــی حوكمـــان قـــورس بـــوو، حیكمـــەتی زۆری تیایـــە

محـــەتتە زۆر جیاوازبـــوو، ئـــارامی زۆری تیـابـــوو
بـــۆ ئـــەو هەمـــوو ساڵـــە، پـــشتمان بـەخوا بەستایـــە

كیتابمـــان دەخوێنـــدەوە، بـــەخۆدا دەچووینـــەوە
لەنـــویژی بەكۆمەڵـــیش، دڵ لـەئـارامـــی دایـــە

ڕۆژێكیـــان بانگیـــان كـــردم، لـــەدواوە دەستـــیان بەستـــم
كـــە بـردمـیانـــە دەرەوە، چـــی ببینـــم خـودایـــە

دایـك و بـاوكی غـەریـبـم، هـاتـونـە بـۆ بـیـنـینم
دانـیـشتون بەكـەساسـی و پـشتیان بـەدیوار دایـە

بەپێـشیاندا منیـان بـرد، ئـەوانـیـش حەپەسابـوون
رۆحـم هـەر لەلاشـەیە خـوای مـەزن نەیكێـشایـە

بردمیانـە نێـو بینایـەك، لەگـەڵم بـوو حـیمایـەك
لـەنـاكـاو لـێم پەیـدابوو، كەسـێ وەك ئـەژدیهـایـە

پـرچ زەردی چاوشـینە، سـەلكە ستـووری پـرقـینـە
بـاڵا بـەرزی ناشـرین، سەیركـە لـەم بـەڵایـە

گرتـمـی زۆر بـەتـونـدی، مـنی لەئـەرزی كـوتـی
گوفتـاری ئینـگلیزی یـە ڕەفتـاری وەك عەزیـایە

لەسـەر كورسـیەكی دانـام، هـەردوو دەستیـشی بەستـام
سـەیـرم كـرد دووانـی تـر، دانیـشتوونە لـەو لایـە

دوای سـەعاتێ سـین وجـیم، هـەروەك ئیبلیـسی ڕەجـیم
بـزربـوون و ڕۆیـشتن، نـەم زانـی هێـشتا مایـە

بـۆ مـحـەتتە هێنـرامـەوە، لەنـاو خەیاڵـدا مامـەوە
هـەربـۆ سبـەی ئێـواری، بینـیم سـەیارە وەستایـە

شـــەوە نـــازانم لەکوێـــم، نازانـــم چـــی دێتـــە ڕێـــم
چارەنـوســـــم نادیـــارەو تـــــەنها خـــوا پـــێی زانایـــە

جلـەکانـیـــان لێ سـەندم، پانکـــەی سـەریـــان پێکـــردم
داوای جلـــم کـــرد ووتیـــان خـــۆ ئێـــستا نەســـەرمایە

تـــا بـەیـانـــــی وامامـــــەوە، لەخـــــوا دەپـاڕامـــــەوە
خـــوایە کـــەتۆ کـردگـــاری، ســـکاڵام بـــۆلات هێـنـایـــە

دیـــسان بۆســـەرێ بـــردرام، بـــۆ بـــەردەم هـــەمان زەلام
ووتـــی هاوکـارمـــــان نـەبـــی، چـــی خـراپـــە لـــەرێتایە

لـە ئاودەســـت بەنـــدیان کـــردم، ســزای ســـەریان تونـــدکردم
دووجـاری تـــر لـــەم شـــوێنە تەحـــقیقم لـــەگەڵ کـرایـــە

دیـسان هـەر بـۆ مـــحەتتە، هـاتـیـنـــەوە ســـەر تـــەختـــە
تـــەخـــتە بـــۆ بەنـــدی ماڵـــە، وەك گـــۆڕی تاڵـــت وایـــە

دووســاڵمان وا تـێـــپەڕکرد، لـــەوێ ژیانمـــان بـــەســـەر بـــرد
زۆر ڕوداوو بـــەســـــەرهات، لــــــەم مـــــاوە ڕویانـــــدایە

بەندیەکان وەکو یـەك نـین، یـەك بابـەت و یـەك ڕەنـگ نـین
بەوێنـــەی گیـــاو دارەکـــان، چـــەشـــنی زۆریـــان تێدایـــە

هەندێکیـــان درکـــی ڕەقـــن، بـــێ خـێــری دەروون ڕەشـــن
بـــۆ خـــودی خـــۆیان زەڕو، زۆرکەسیـــان ئەزیـــەت دایـــە

هـەندێـکیـــش گەوهـــەردارن، نـــاخ پـاکـــی هەڵـــەدارن
هـــەر لەگـــۆڕانکاریدان، ئـومێـــدی خێـــریان تـیایـــە

کەســـانێك بـــێ تـاوانـــــن، بـــە زوڵـــم لـەزیـنـــدانن
بـــەم شـێـــوە پارێــــزراون، لەبـــەڵای ئـــەم دونـیـایـــە

چەشـنـێـکیـــش تـاوانـکـــارن، پـــلەدارو ستـــەمکـــارن
ئـــازادی زەمانـێـکـــــن، فـیـتـنـــــە دەوریـانـــــی دایـــە

ڕۆژا یـــازدەی ڕەمـــەزان، بـــەرەو ئـیـنـفـــرادی بـردرایـــن
وەك مـــار لـــەپڕ پێـوەدرایـــن، ڕاپـــۆرتی زۆر نـوسـرایـــە

ڕاپـۆرت نـووس بـارك بۆشـن، بـێ هـۆش و دڵ نەخـۆشـــن
نـازانـــــن لەپـــــڕ مـەرگـــــەو مـــــردن لەبۆسـەدایـــە

کەچوویـــن بـووبـــە بـــەتانی، نابـــێ یـــەك کـــەس بزانـــی
ئێمـــە لـــەوێ بـــۆ ئـێـــرە وا تەشریـفمـــان هێـنـــایە

لـــەو سەفـــەرەی ئەوجـــارە، بـاشتـــر لـەزێـــڕو پـــارە
بۆمـــان هاتـــەوە کایـــە، کـــات و بـــرای لەبـــەر خـوایـــە

ناوی خوامـان لێ هانـی، دەسـت و قۆڵمـان هەڵماڵـی
ماڵی تاریـك مُنـوَر بـوو، بـە (تنزیـل) فـەزڵی خـوایە

لەم ماوە کە لەوێ بووم، غـەرقی غـەمی دایکم بـووم
کـاتێ دەهاتـە سـەردانم، بەکـوڵ دەگریـا دایـە

بۆ باسی باوکم نەکەم، بـێ دەنـگ و بـێ نـازەکـەم
داخـی ئـەو لـەناخی بـوو، یعقـوب ئـاسـا سووتـایـە

بـرای دڵسۆزم دکتۆربـوو، لـەمن زیـاتر خەمخۆربـوو
دەزانم لەهـەر کـوێ بـێ، هـەوڵی خـۆی بۆمـن دایـە

شـەوێ لەسەعـات یـازدە، پێیان دایـن یـەکێ فـەردە
گوازراینـەوە PMF، سـجـنی نـوێ دروسـت کـرایـە

ئەگەرچـی بەمۆڵـەتێك، هەمـان بـوو تەنکـە ڕیـشێك
کەچـی لەسـەر ئـەم ڕیـشە، چـوار ڕۆژ دەسـتم بەسـترایە

پاشـان دوو مانگێـك دەبـوو، هەرچـی مەحکومـە هـەموو
دایـان نـاین لەقاعـەی دوو، یادگـاری خۆشـی تیایـە

ئینجا لـەپاش ئـەم وەختـە، هەموویـان بـردە مەحەتتـە
بـەس ئـەم دوانـەمان نەبـێ، ڕۆژانـمـان لـەوێ مایـە

ڕۆژانــیش زوو دێ و دەچــوو، بوونمــان لــەوێ غــەدر بــوو
زانــیمــــان مــافــــی (UN)، بــۆمـــان زۆر هــەوڵیـــدایە

تــا ئێمەشــیان گەڕانــدەوە، ئــەم بــارەشــمــان پــەڕانـــدەوە
چـــووم بـــۆ قــاووشـــی حەفتـــەم، ڕۆژان ڕۆژی لــەدوایـــە

پاشــان چــوومە قاعــەی چــار، مامــەوە تێیــدا دوو بــەهار
هــەم دیــسان بــۆ قاعــەی حــەفت، ئینجــا ســنگم کوتایــە

دوو لێبـــوردنی گــشتی درا، ئێمــەی لێ بـــێ بــەش کــــرا
تایبەتـــەکانیش هــەرهیـــچ، بـــەس خــــوا دادوەری لایـــە

دوای (١٢) ســـــاڵ و ســــێ ڕۆژ، چـــاوەڕوانی ڕۆژ بـــەڕۆژ
بــاوکـــم وەفــاتـــی کــــردو یــەکجــاری لێــم دابڕایـــە

لــــە (١٥)ی شــەوالدابـــوو، لـــە (٣٢)ی کــــۆچی دابــــوو
لــەدوو دەرگــای بەهەشــتم، دەرگــایــەك لێــم داخــرایـــە

بینــا نوێیەکــەی کەسنــــەزان، ئامـــادەکرا بـــۆ زینـــدان
ســەرەتا چــووینە قاووشــی دوو، وەجبــەکیش بــەڕێ کرایــە

بـــەرواری (٣/١٥)بـــوو، هــــەرچی مــەحکومـــە هـــەموو
گــوازرایـــنەوە ئـــەو سجنـــەی، لەنــاو کەســـنەزان دایـــە

سجنە نوێیەکە جیاوازبوو، بەندە تێیدا مورتاح بوو
(١٥) ساڵە شوێنی وا، بەندەی تیا نەبینرایە

بەڵام زۆری پێ نەچوو، هەموو خۆشیم لێ تێك چوو
خەریکە خوری ئومێدم، وا لەمئاوابوون دایە

لەرۆژی جومعەو سەدا، لەکاتی عەصرو نزا
دایکم وەفاتی کردو، دونیام لێ تەنگ کرایە

خوایە ئێمە گشت هی تۆین، هەر بۆلای تۆش وا دەرۆین
هەزار حەمد بۆتۆ کەتۆ، ئەم ڕۆژەت بۆی دانایە

لەرۆژی (١٢)ی ڕەجەب، ساڵی (٣٦) ی هیجرەت
ئەو دەرگایەشم لێ داخرا، تەنها ڕەحمی خوا مایە

ماوەی حوکممان تەواوکرد، بەزیادەی (٨)مانگی خشت
لەرۆژی (٨/٢)ەوە، إفراج شرطیمان مایە

حاکم گەیلان پێ ی نەداین، گوایە خاوەن پێشیناین
سەیرە ئەوها بە ئاسان، شتمان بۆ هەڵبەسترایە

کەوتە لای عبدالباسط، ئەو لەتەمیز بەنجی کرد
لەدوای (٣)مانگ هەرنەیکرد، ووتمان قەینا ترسایە

دوای زیـاتر لــه(۲)مانــگی، وەستــان و چــاوەڕوانی
إفــراج شــرطیمان پــێ درا، شوکــر بۆتــۆ خودایــه

لــەدوای (۸)مــانگ و(۸)ڕۆژ، بــه پــەرۆش و هــەم دڵخــۆش
چــووینەوە بــۆ ئاســایش، بەحــساب هیــچمان نەمایــه

پێــشوازیان لێکــردیــن، پیــرۆزبایــیــان لێ کــردیــن
ووتیــان دووســێ ڕۆژی تــر، ئیــشتان لێــره نــەمایــه

لەوێــش هەربــۆ قاووشــی (۷)، بارگــەم دانــا بەهیمــەت
حــەفتاو دووکەســی لێ بــوو، ووتم جــێ ی مــن نــەمــایه

لــــەدوای (۲٦) ڕۆژان، کەوتمـــه قـــاووشی کارمەنـــدان
(۱۲/۱۹) یـــەك شەممـــه، بردمیـــان بـــۆ بیـــنایه

دەست و چاوم توونــد بەسترا، تحقیـق لەگەڵم دەست پێکرا
(۱۹) ســاڵ لــەپێش ئێــستا، تــۆ کوشــتنت ئەنجــام دایــه

دووســەعــات و نیــوی بــرد، ســەرتــاپــا نکــوڵیم کــرد
بەفــشارو هەڕەشــەی زۆر، ووتیــان بــڕۆ هێــشتا مایــه

هێــنرامەوه قاعــەکەم، پێــشبینی خــراپتر دەکــەم
بــۆ بــاره ئاڵــۆزەکەم، خــوایه هــەرتۆم پەنــایه

لەبیست و یەکی دوازدە، هەردوو دەست و پێ ساردە
جارێکی تر بۆ تحقیق، بردمیانە نێو بینایە

هەم دەست و چاوم بەسترا، پرسیاری زۆرم لێ کرا
لەدوای زیاتر سەعاتێك، ئاسانی هاتە کایە

براکەی خۆشم بەم شێوە، دەیهێنن و دەیبەن بەرێوە
حاڵی ئەو زۆر پەشێوە، بەڵکو ورەی بەردایە

هەردووکمان لەبەردەم باری، بەزەلیلی و بەغەمباری
خوایە مەگەر تۆ بەخۆت، لادەی لێمان ئەو بەڵایە

(٢٩)ی دوازدە بەشکلی، بۆ بەردەم محقق عدلی
ئامادەبووین هەردووکمان، هەرچی دەیکەن کرایە

لە (٣٠)ی دوازدە بەقیود، تا بەردەم حاکم مسعود
ووتمان چی لەپێش تۆیە، لەژێر فشار وەرگیرایە

بێ شك خوا ئاسانی کرد، دۆسیەکەی وا بەرێ کرد
نزاکانی قەبول کرد، چەند (عظیم)ە ئەم خوایە

پاشان لەوێ ماینەوە، ئەم ساڵ بەغەم تواینەوە
هەرچۆن بێ بەرێمان کرد، ئومێدیشمان هەر مایە

ئـیـــنجا لـــە (٢٠)ی دوازدە، تەســـلیم کـرایـنـــەوە شورتـــە
بردرایـــن بـــۆ مکافحـــە، ووتـیـــان زۆرتـــان نـەمـایـــە

ئێـستاش وا لەتـەوقیفین، سـەر بـەشـورتـەو پـۆلـیـسین
نـازانـیـــن لـەڕۆژانـــی دێ، کـــام ڕۆژ ئـــازادی تـیـــایە

ئـەوەی نووسـیم بـەپوختی، ژیانـــم بـوو زۆر بەکورتـــی
ژیـــانم لـــەکونجی زیـنـــدان، زیندانێـــك بـــۆم نـــوسرایە

زۆرێکـیش پـێم نانوسـرێ، تـــاڵ و قورســـن ڕێـــم نـــادرێ
ئەوەنـــدە بـــۆمن بەســـە، لای پــەروەردگار نوسرایـــە

تـاوانبـــار هـــەن ئـــازادن، پولـــدارن هـــەم چەکـــدارن
یاســا بـــچووکە لەئاســتیان، بـــۆ هەژاریـــش کـــەڵەگایە

زیندانـیـــش هــەن بـێ نـازن، دەناڵێـنـــن بـێ گـــوناهن
لەتـــەنگانەی بـــێ دادین،دادیـــش مـــردووەو نـەمـــایە

* * *

زەبـــری زەبـــوونی و زنجـــیری زیـنـــدان
زرمـــەی زریـــانی بـــەزۆردار زیـــڕان

# زمان

زمـــــان ئـەنـدامـێـكــــه دووســــەره لـــــەدووان
چـاكـــــەو خـراپـەيـــــه تـــۆی خــــاوەن فـــــەرمان

پـارچــــــه گـۆشـتـێــــكه لـەنـێــــوان دوو لـێـــــوان
لــــــەو ديــــو بـەنــــدكراوه بــــــەدوو ڕيـــــز ددان

گـــــــەر ئـــــــازادی كـــــەی گـــــشت دەم و جـەمـــــان
دەتـكــــــا بــــــه پـەنـــــــدو عيـبـرەتـــــــی زەمــــــان

بـەڵــــكو بـەنـديـــــكه لەنـيـــــو ســــــەد زيـنــــــدان
تـــــاڕادێ لـەســـــــەر ڕاستــــــی و قـــــسـەی جـــوان

دەبيـــــــــنی كـــــــوفرو زۆر لـــــــــه گـونـاهــــــــەكان
بـەزمــــــان دەووتــــــرێ و دەچـەسـپــــــێ سزاكــــــان

دەربـڕيــــــنی بــــــێ بـــــاوەڕی بـەخــــــودای ڕەحمــــــان
يــــــا بــــــێ ڕێـــــزی كـــــردن بـەپـيــــرۆزی يــــــەكان

يــــان كــــوفری بــــچووك و گوناهــــــه گـەورەكـــــان
وەك ســــوێند بـەشـــێخ و ســــەرۆك و گــــۆڕی فڵــــان

هەروەها درۆکردن لەگەڵ خەڵکان
لەمامەڵەو هەواڵ و نوکتە هەڵبەستان

خۆخستنە ڕیزی زاڵم و ستەم کاران
بەمەدح و گوتن بەشان و باڵیان

یاخۆ خستنە بەر هەڕەشەی سووتان
بەسوێندی درۆو بەدرۆ شایەت دان

ئینجا بوختان و قسە هەڵبەستان
توانج و تانەدان لەموسڵمانان

خواردنی گۆشتی مردووی برایان
بەغەیبەتکردن و بەخراپ ناونانیان

خۆ بێ بەش کردن لەبەهەشتی فراوان
بەگواستنەوەی قسەی شەڕ لەنێوان دوان

مەگەر نەتبیستووە لە خیر الأنام
دەفەرموێ (لایدخل الجنة نَمام) ؟

بۆ دەچیە ڕیزی گێژو گوێ درێژان؟
بەگۆرانی و بەندو هاوارو قیژان

خۆناشرین کردن و تەنی لەڕوودان
بەقسەی نابەجێ و سوك و جنێودان

خۆ تەنیاکردن و تێکدانی خێزان
بە تووڕەبوون و تەڵاق فڕێدان

بۆیە ووتراوە زوو لەدێر زەمان
بێ گومان پەندە بۆ ئێمە هەمووومان

إحذَر لِسانَكَ أيُها الإنسان
لا يَلدَغنَكَ إنَهُ ثعبان

جا گەر دەتەوێ لەڕۆژ و شەوان
سەر لەئەمان بێ و دوور لەئۆف و ژان

خەڵکی بێ وەی بن لەتۆی موسڵمان
تۆش سەلامەت بی لەمار پێوەدان

زارت ببەستە بەتەقواو ئیمان
بێ دەنگ بە گەر نەتبوو قسەیەکی جوان

بە زیکری زۆرو خوێندنی قورئان
بتارێنە شەوو تارمایی دڵان

بـــــه ئامۆژگـــــاری و ڕێنمایـــــیەکی جـــــوان
ئومـــــێد ببەخـــــشه بـــــەدڵێکی وێـــــران

بەحیکمـــــەت و بەپێـــــی توانـــــای سەرشـــــان
فـــــەرمان بەچـــــاك و نەهـــــی کـــــه لـــــەخراپان

بـــــا ڕەزامەنـــــدی خـــــالقی مەننـــــان
نیـــــازو مەبەســـــت بـــــێ لەهـــــەر ووتـــــەو ژوان

* * *

زمان
یـــا زایـــەڵـــەی زانـــست و زێدی زەعفەرانـــه
یـــا زێرابـــی زەحمـــەت و زەنگـــی زەردە واڵانـــه

# جگەرەی جگەر بڕ

باسێکم بۆتۆ پێیە، ئەی کاکی ئادەمیزاد
گەر خۆت پێ ژیرەو بێ هەست نی وەك لباد

مەڵێ کوتانی شاخەو هەم ئاسنی ساردە
خوم پێوە گرتیەو ئەو دڵەم پێی شادە

خودا بەتۆی داوە هزرو بیرێکی ڕەشاد
تا بۆکاری شیاو بچی ببیە کەسێکی شازاد

ئەو باسەی دەیبیستی باسی دوژمنێکە
تۆ کەوتیە تەڵەو داوی وا سەردەمانێکە

چەکی ئەو بەڕووی تۆ دەردو ژەهراوێکە
دەی وا پێتی دەنووشێ دەمێکە وساڵانێکە

شەرع بڕیاری داوە بەحەڕامی جگەرە
چونکە سەرتاپا زەڕە بۆ خودی ئەم بەشەرە

هەرچـــی ئەنــــدامی لەشــــە، دەرەوە یـــا هــەنـــاوی
گــرو زیــانی جگــەرە کــەم یــا زۆر دەچــتە نـــاوی

هـــــەروا بـەفــــیڕۆدانی، پـــارەو پــــول و دۆلارە
ئــەو پارەی هــەق و بەشـی،خەڵکی هــەتیوو هــەژارە

لەگــەڵ بێـزارکــردنـــی، دۆســتــان و کــەس و کــارە
هــەروەهـــا ئــەزیـەتـــدانی، مەلائیکــەی ئەبـــرارە

ئینجا ژەهـراوی بـوونی، ژینگـەو هــەوای ئـەم شــارە
پـیس بـوونی کوچەو کۆڵان، بـەزبڵ و قونکە جـغارە

دەبینـی چـەندە سـەیرە، کـە ئـەم مـرۆڤـە گەورەیـــە
بـەو ڕێـزەی لێ ی گـیراوە، بەنـدەو کۆیلـەی جگەرەیـە

بەرگـەی برسێتی دەگـرێ، سـەرماو گـەرما گـەمـەیـە
کـە جغارەی لێ ببــڕێ، سـواڵـدەکـاو پـێـی فـشـەیـە

ئــەوەی جگـــەرە پـێـــت دەدا تـفـتـــاوو تاڵاوێـکـــە
ســـەری ئـاگـــری ســـورەو پـشـتـیـــشی زەرداوێـکـــە

بەجگەرە تۆ خۆت دەكوژی بەڵام زۆر بەهێواشی
تا ئازارت زیاتربێ و لەژیان بكەویە پاشی

بۆنی دەمت بۆگەن و هەناسەشت پیس دەكا
بەوێنەی مشكە تۆپیو خەڵك هەراسان دەكا

ئینجا بەهەموو دەردێك ئاشناییت لەگەڵ دەبی
پاشان بەهیچ پزیشكێك چارەسەریشت نابی

زیاتر لەسەد نەخۆشی هەمەجۆرو كوشندە
بەهۆی جگەرە كێشانە لەخۆت مەبە دڕندە

هەناسەی ساف و بێ خەوش و خاوێنی
پیس و پۆخ دەكا بەدووكەڵی شینی

كانیاوی شیرینی لیكی پاكی نێو زار
تاڵ و تفت دەكا هەروەك ژەهری مار

ئەم زمانەی تامی، چێشتی پێ دەكەی
لەم كارەی دەخەی، بۆ وای لێ دەكەی ؟

تـــام لـــەهیچ ناكـــەی، ئـیـــشـتـیها بەرمیـــە
هــەر شتـێــكیش بخـۆی، بـۆ خــاتری جگـەرمیـــە

پـــدوی پـەمپـــەو ســـۆری پـــڕ خـوێـنیـنـــت
ڕەش و ڕەق دەكـــا وەك خـەڵـــوزت جـــوی بیـــت

ئـــەو ریـــزە ددانـــەی، ســـاف و سپـــی هەڵكەتیـــە
ڕەش دەكـــاو هــەر دەڵـــێ ی، تــۆپی لـــەناو تەقیـــە

ئـــەو ریـــزە بـــەندیەی، خـــوا بـــەددانی بەخـــشیە
دەیرزێـــنی هــەر دەڵـــێ ی زنـــجیرە ژەنگـی گرتیـــە

گـەر ئـەو ددانـــە ڕەقـــە، ئـاوای بـەســەر بـێـنــێ
دەبـــێ چـــی بەسەرگـۆشت وخـوێنی گەشـت بێنـــێ

ڕەنگـــی لـــێوی ســـۆرو جـــوانی پـەمبەیـــت
ڕەش و مـــۆرنجی دەكـــا و هـــەر دەڵـــێ ی پیریـــت

دروشمـــــی دیـــارو ڕوونـــــە زوو پـەككـەوتـنـــــە
سیـمـــای پیـــری پـێـــش وەختـــەو زڕانـــی خەوتـــنە

**هەستی بۆنت نامێنێ بۆنی خۆش بۆ لێدەدەی**
**هەرکە جغارەت پێکرد دەوروبەر ئەزیەت دەدەی**

**ڕەنگی ڕووخساری گەشت، سیس و زەردو سیخ دەکا**
**بێ سوودە کرێم و شامپۆ، ڕووت هەر لەمردوو دەکا**

**گەر نەتوانی فڕێ ی دەی ئەو لەنێو پەنجەت نیە**
**بەڵکو تۆ دیلی ئەوی و تۆش هیچت بەدەست نیە**

**وانیە قەت وانیە ژیری یەکەت نەفامیە**
**چۆن لەخۆت ڕازی دەبی توانای جغارەکت نیە**

**کەسایەتیت بەشەهادەو سەرو کەللەی زل نیە**
**بەڵکو بەشەهامەت و بڕیاری فڕێ دانیە**

* * *

جگەرە جارە بۆ چەرخ و جبەخانە
لەجومگەو جەمسەری ئەم لەشە جوانە

# پاڕانەوە

بـۆچـی تـۆ دوعـایێ نـاکـەی؟، تـۆ بـۆچـی پـرسیار ناکـەی ؟
بـۆ ڕوو لـەئاسمانێ نـاکـەی؟ هـیـچ داوایـەك بـەرز ناکـەی ؟

دەی تـۆخـۆت بـەچی دەزانـی، بناغـەو بنـەوانت لـەچیـە ؟
وا دیـارە خـۆت لەبـیـرنیە، بوونـت لـەئاوی مەنیـیـە

تـۆ تـەنـها لەکاتـی تـەنـگانە، دێتـەوە یـادت خـوای تاقـانە
دەی ئـەو لەهـەموو سـات و ئانـا، نیعمـەتی بەسـەرت وەك بارانـە

دەقـی ووتـەی، خـودای مەتینـە، دوعـاو نـزا بـەنـدایەتـی دیـنە
فیـزو لـوت بـەرزی خـۆ نەناسینە، زەلیلـی بـۆ خـوا کـڕۆکـی دینـە

تـۆ هـەژاری و پێویـستیت هەیـە، بـێ هـێـزو لاواز کێـشەت هـەیـە
خـوا دەوڵەمەنـدەو مـولکی هـەیـە، بـۆ سەرخـستنت توانـای هەیـە

ئەوە سولەیمانە پێغەمبـەرو پاشـایە، هەرچی هەیـە لەبەردەسـتی دایـە
کەچی هەردەم دەم بەنزایـە، لـێم خۆشـبە، زەنگینـیم تـۆ بـەمنت دایـە

گــەر نــەخــۆشـــی و دەردەداری، بـــەدەم ئازارێـــکـــا گــرفــتـــاری
ڕوو لـــەخالق کـــەو بپـــاڕێوە، پـاشافـــی بـــەژانم تـــۆ ئـــاگاداری

خۆ (ئـەیوب) لـەتـــۆ دەردەدارتـربـــوو، لەتـــۆ زیـاتــر خـۆ ڕاگرتبـوو
تـا خـوا بەڵاکـەی لەسـەر لابـردوو، پێـی داوە زیـاتر لـەوەی لێ ی سـەندبوو

بـۆ کـەم و کــوڕی و سەرپێـچیەکانت، لـــەدەست گونـاهــو تاوانـەکانـــت
داوای لێخۆشبوون کـە بـەدڵ و گیانـت، پەشـیمانی دەربـڕە بـەنوزەو گریانــت

بەوێنــەی (ذا الکفل) و تەوبـەکاران، ئومێـد بەرمـەدە بـەڕەحمی ڕەحـمــان
وازبێنـــە لـــەگوناه ببـــە پەشیمـــان، بڕیـــاردە چیتـــر نـەیکـــەی تـــاوان

گەرتـــۆ گـەنجـی و خوێنـت گەرمـە، پـاکی و ڕەوشـــت بـەرزیـــت عـەزمـە
پـەنـــاگرە بـەخـــوا لەهەرچـــی بەزمـــە، مـعـــاذالله بـــۆ تـــۆ دروشمـە

مەگـەر (یوسـف) نـەیبـو دانـایی، لەگـەڵ ئـافرەتێ نـەکەوتـە تـەنیـایـی
کە پـاکی هەڵبـژارد بەسـەر ڕەشـایی، دەرگاکـانی بـۆکراوە و کـەوتـە بـەرزایی

گـــەر مـاڵــت چۆڵـەو منداڵــت نیـــە، گـوێـت لـەگـرو گـاڵـەیـان نیـــە
بڵێ ئـەی ئـەوخوایـەی هاوەڵت نیـە، منـداڵـم پـێ بـدە لات قــورس نیـــە

پیاوێکی پیرە پێغەمبەر زەکەریا، سارپرەش نەزۆرکەو بەدەستی خۆی نیە
دە پێم دە منالێ لەریزی ئەولیا، خوا رەحمی پێکردو پێی بەخشی یەحیا

گەر دیل و بەندی لەکونجی زیندانای، لەنێو دیوارو قفل و ئاسنای
خوایە هاوارم بۆ لات هێنای، بۆ رزگاربوونم هەرتۆ بەتوانای

کێ وەکو (یونس) دیل و بەندبوو، کێ شوێنی وەك ئەو تاریك و تەنگ بوو؟
خودا وەڵامی داواکەی داوە، بۆلای قەومەکەی دیسان گەراوە

گەر دایك و باوکت لەژیاندا ماون، گەنجن یا پیرن و لەجوڵە خاون
یاخود مردوون و بەجێهێڵراون، تا نزایان بۆ بکەی چاکە پێ دراون

کە پێغەمبەر (نوح) لەقورئان هاتووە، بۆ دایك و باوکی دوعای کردووە
دەی ئێمە کێین و چەندمان ماوە؟ بۆ دایەو بابە هەوڵمان داوە ؟

هەرکاتێکیش داوایەك دەکەی، گرنگە لەوەڵام پەلەی نەکەی
سوودمەندی تۆ زەرەر ناکەی، لەئێستادا یاخود لەسبەی

گەر ئەوەی ویستت دەستت هێنایە، بەهەرەو بەخششی خیرایە
یا لابەری کارەساتێکە، یا چاکەیەکەو بۆت نووسرایە

دەبێ لەنزا دڵ بێداربی، هەم زەلیلی پێوە دیاربی
ڵاڵانەوەو نوزانەوەی تیابی، پەرۆشی و کزۆڵی پێوە دیاربی

لەسەر چۆك و ڕوو لەقیبلەبە، لەش پاك و دەست بەدەست نوێژ بە
لە ڕەتبوونەوەی باترست هەبێ، لەگیرابوونی ئومێدت زۆر بێ

بەخەسڵەتی پاك ناوی خوا بێنە، بەحەمدو ثناء زمان ڕابێنە
لە صەڵات و سەلام واز مەهێنە، لەدوعاو نزا دوور ڕامێنە

بەخۆت و گوناهت دەست پێبکە، دایك و باوكت لێ تێربکە
جا خوشك و براو هەر كەسێكە، ئازارت داوە بە هەرشتێكە

ئینجا خۆشەویست و خزمان، لەگەڵ ناسیارو جیران
گشت خوشك و برای موسڵمان، لەهەر كوێ هەن لەجیهان

ئینجا چ كاتێ دوعا دەكەی ؟ كەی باشە بۆتۆ داوا بكەی
بێ شك كاتی سوژدە دەبەی، خۆت لەخوا زۆر نزیك دەكەی

كاتێك باران دەباری، كاتی ڕۆژوو دەشكێنی
كاتێ لەخەو هەڵدەستی، بۆ نوێژو خەو دەتۆرێنی

كاتی جیهادو جەنگەو وەستان بەڕووی دوژمنە
دوعای ڕۆژی عەرەفەو دوا عەسری جومعەی منە

دەشەوی كۆتایی ڕەمەزان، شەوی بەقەدری قورئان
شەوانی ڕۆژی جمعەو پارشێوی هەموو شەوان

لەکاتی خەتمی قورئان، لەنێوان قامەت و بانگدان
ئەم ساتانە فرسەتن، بێ ئاگا مەبە لێیان

کێشەی ئێمەش ئەوەیە، تەمبەڵیمان پیشەیە
دوعاشمان بێ سوغرەیە، نازانین چەند گەورەیە

چاومان هەر لەبەندەیە، بەندەش وەك مە بەندەیە
چی پێویستی بەندەیە، بێ شك لای خوای بەندەیە

کە ڕوو دەکەینە ئاسمان، بەرز ڕادەگرین دەستمان
دەبینین پانی ئاسمان، پڕاوپڕ لە ئەستێرەی جوان

هەر خودی ئەم دیمەنە، سەرەتای دوعاو دەندەنە
بۆتۆ دەرس و وانەنە، کە هەرچی داواکەی هەنە

دەی بۆچی دوعا ناکەی، تۆبۆچی پرسیار ناکەی ؟
بۆ ڕوو لەئاسمان ناکەی، هیچ داوایەك بەرزناکەی ؟

دەی پێویستە بزانی چ شتێ کۆسپ و بەربەستە
ناهێڵێ گیرابێ ئەو دوعایەی مەبەستتە

خواردنی ماڵی حەرام و زۆری گوناهو تاوانە
ستەم کردن لەخەڵکی و بێ ئاگایی دڵانە

یـــان بـــڵێ ی بۆچـــی نـەمـــدی بـــۆ دوعاکانـــم وەڵـــام
یـــا نـزاکـــەی بـەبڕینـــی پەیوەنـــدی خـــزم و ســـەلام

ئەمـانـــە گـــشت ڕێـگـــرن کـــە دوعاکـــەت بـــەرزبێ
دەســـا دڵـــسۆز هـــەوڵدە ئـــەم بەربەستانـــە لاچـــێ

دوعـــا تیـــروکەوان و چەکـــی پـاکـــی دیـــنداره
چـــەکیش بەدەمـــی تیـــژو هێـــزی لـــێدەر بـــەکاره

ئـینـــجا کەبەربەستەکـــان خـــاوو خیـــسکیان کـــرد کـــەوان
تـیـرەکـــەش هەرخـــاو دەڕواو زۆرجـــار نـاگـاتـــە نیـــشان

* * *

لەدەســـتی دیلـــی و دە یجـــوری دونیـــادا
وا داوای دڵـــی دامـــاوم بـەخـــوا دا

# گریان و پێکەنین

چ خەندەو پێکەنینە، چ گریان و غەمینە
دوو پێویستی مرۆڤن، بۆ بەرەودان بەم ژینە

هەردووکیان هەڵقوڵاوی، کانیاوی دەروونن
تەواوکەری یەکترن، بۆ ژینیش زەروورن

هەریەکێ لەم دووانە، سنووری بۆ دانرایە
هەموو شتێك بەخوێ یەو خوێش بەمست و مەعنایە

بۆ ئەمەو هەموو شتێك، باوەڕدار شوێن کەوتیە
بۆ پێشەوای خۆشەویست، چۆن هەڵس و کەوتی کردیە

پێکەنینی پێغەمبەر، تەنها بزەو خەندە بوو
کاکیلەکەی دەردەکەوت، گوێت لەدەنگی نەدەبوو

دڵسۆز بوو بۆ ئوممەتی، لەپەرۆشی و لەغەمیا
کەم دەبینرا پێبکەنێ، بەڵکو زۆر کات دەگریا

ئایا ئێمە بەقەد ئەو، بۆخۆمان لەگریاندایین ؟
یاخود لەپێکەنین و بێ ئاگاییەکی قوڵ داین !

لەبەر زۆری گوناهو، کەمی توێشووی چاکەمان
دەبوایە زۆر بگرین و دەگمەن بوا پێکەنینمان

دەبوا لەترسی حەشرو لێپرسینەوەی ووردا
دەروونمان پرسە دانێ و غەم بباریٚ بەڕوودا

وەرگرتنی کیتاب و خوێندنەوەی ئەوەی تێیدا
کێشانی کردەوەکان، ڕۆیشتن بەسەر پردا

بۆ بەهەشتە یا دۆزەخ، بەرەو کوێ چارەنووستە ؟
غەمێ بخۆ لەحاڵت، بێداربەو لەخەو هەستە

یا لەبەر حاڵی تاڵ و پڕ ناسۆری هاودینمان
غەم وەکو تا دامانگرێ، بگرین بۆ بێ هێزیمان

یا بۆ بێ نازی دین و قورئانەکەی باری مان
سوێند بخۆین دانەنیشین تا نەبنە چەتری ژینمان

ئەوسا خەندەو خەنینم، هەتوانە بۆ برینم
چونکە خۆ من دەمێکە هیوام ئەم ڕۆژە ببینم

* * *

گریانم بۆ گورجی گورگی گۆرە پانە
گەلیشم گوێگری گۆرانی گەوجانە

# برادەر

بــــــــــرادەر دەرگـــــــــای دەرەوەی تۆیــــــــــە
جــا ســەرنجدەو بزانـــە، لەگــەڵ كێــت هــات و چـۆیــە

وا فیـتـنـــەو بــەڵا زۆرن، بـرادەریـــش هەمـــە جـــۆرن
هەنـــدێكیان بـــەراو دەردن، هەنـــدێكیش ســـەرەخۆرن

چەشـنێكیان چەشـنی چێشتە، ســێ ژەمــە بـۆت پێویـستە
نــاكرێ دەســت بــەرداری بــی، بــۆ ئێــسك وەكــو پیــستە

دووەمـیـــان وەكـــو دەرمـــانە، بـــۆ كـــاتی نەخۆشیمانـــە
لەمـــە زیـــاتر زیادەیـــە، هـــەموو شتـــێ بـــە ئـەندازەیـــە

ئـــەوەی تـــر وەكـــو دەردە، ژەهـــرە درکـــە حەســـوودە
دوژمـنـێكـــی لـــەدودە، بـــەردە ڕەقـــە بـــێ ســـوودە

بـا هەرگیـــز نزیـك نـەبــێ و نـهێـنــی تــۆی لانەبـــێ
چـــوون هـــەركاتێ هەڵگـــەڕێ، بـــەخاڵی لارت زاڵ دەبـــێ

گــەر حەزدەكــەی بزانـــی، خەڵــك بـــۆت چـۆنـــە زاری
بــۆ هاوڕێــت ڕایــان چـیە، تۆشـیان هــەر بــەو چواندیــە

جۆرێـــك وەك كورەچـــیە، خـــۆی ڕەش و پــیس كردیـــە
هــەركاتێ لێ ی نزیــك بــی، زیــانێكی پێــت گەیـانـدیـــە

یــا تـۆش وەك خـۆی پـیس دەكــا، لــەبەرچاو ڕەشـت دەكـا
یـــا شـوێـنـێكـــت ئـــەسوتێ، یــا بــۆنی ناخۆشــت بـــۆدێ

ئــەوەی تــر وەك بــۆن فرۆشــە، خۆشـی بـۆنی هەرخۆشــە
گـــەر هاوڕێـیـەتـــی بكـــەی، نـــاوی بــاش پەیـــدا دەكــەی

یــا بۆنێكــت خــەڵات دەكــا، یـــا ئـامـۆژگاریـەكــت دەكـــا
یــا هەســت بەخۆشــی دەكـەی، كــە بـۆن خۆشـی لادەكـەی

هەنـدێك چـاویان لەماڵــە، بــێ كــار بــەرِكیــان بەتـاڵــە
نـــەزان و بــەگـــرو گاڵـــە، هــەرچـــی بڵـێـــن خـەیـاڵـــە

چــەند هــاوڕێ ی خــۆت بینیــوە، بــۆ پــارە بــۆت بەزیـــوە
كاتـــێ كـــە لـێــت قـەومــاوە، فـرِیـــوە و نــــەت بـیـنـیـــوە

لـــە ئەزمـــەی نـــان و سگـــدا، بـــرادەر بخــــۆو بـڕۆیـــە
لەشــــەوانی جــــەنجاڵی ڕاستـــــی كەمــــەو هـــــەر درۆیــــە

هەنــدێکیش گــەنجی بــەنجن، تامــەزرۆی زینــاو بــەزمـــن
بــەڕۆژ مەســت و سەرخۆشــن، شــەو خــەڵوزی خامۆشـــن

شیــێت و شــەیدای کەلــەشن، لــە علــم و عــەقڵا بــێ بەشــن
خولیــای حــەب و حەشیــشن، بــۆ شــەیتان گۆشــتی شیــشن

وای چــەند بــێ هــۆش و مەســتن، بــێ شــعورو بــێ هەســتن
لـــە هەرچــی چــاکە پەســتن، ئــالودەی جوانـــی پــیـــستن

هەنــدێکیش کەللــە بۆشـــن، بەنــدەی بانــدی نێــو کۆشــکن
خــۆ ویــست و بــرادەر فرۆشــن، لەخـــەمی گـــەدەو کۆشـــن

ئەمانـــە وەك جاسوســـن، ڕاپـــۆرت نـــووس و جاســـوسن
بەنـــدەی پـــول و فــلوســـن، ڕاوکـــەری ئـــاوی پیـــسن

لەســـەر بابیـــان دەنوســـن، دەم موســـی زوبـــان لوســـن
دەنـــگ و بـــانگی ناقوســـن، ڕوو ڕەشـــی چارەنـــووســـن

دووربـــە لـــەو هاوڕێیانـــەی، دیارنیـــە جێگـــەو لانـــەی
ئـــیش و کـــاری ڕۆژانـــەی، کـــوڵان بـــۆ ئـــەو کۆڵانـــەی

کــات و عــومـــری ڕۆیـــە، عـــەقڵ و هـــزری جۆییـــە
کـــەیفی دێ بڵـــێن خۆڕییـــە، هـــەرخۆی لـــەخۆی گۆڕیـــە

چەشـــنێك ژیانیـــان فـــشەیە، گاڵتـــەو گـــەپ و گەمـــەیە
بەنـــدو گـــۆرانی و ســـەما، قـــسەی بـــێ جـــێ و بـــێ بنـــەمـــا

لاسایی کەرو شوێن کەوتـەن، بـۆ هـەموو دۆخێـك سینگ کوتـەن
دۆڕاوانـــی پـــێش وەختـــەن، ڕۆڵـــەی خراپـــن بـــۆ وەتـــەن

کێـشەی زۆربـــەی گـــەنجانمانن، دوورن لەعەقیـدەو دینمـان
وەلائـــو بـــەڕاء نـــازانن، کەرەســـەی دەســـت بـــێ دینـــانـــن

هانـــدەری یانـــەو لاعـــیبن، دەنگـــۆی بیـــانـــی و غـــەریبن
خۆشـــحاڵی بردنـــەوەیانـــــن، یـــانـــەش پێیـــان نـــازانـــن

دروشـــم و کـــاڵایـــان دەکـــڕی، بـــۆ وان برایـــەتـــی دەبـــڕی
ســـۆزی بـــۆیـــان دەردەبـــڕی، بـــۆ دۆڕانیـــشیـــان دەگـــری

ووتـــەی پێغـــەمبـــەری تـــۆیـــە، لـــەغـــەم و پـــەرۆشـــی تـــۆیـــە
کێـت خـۆش بوێ لـەم دنیایـە، دوا ڕۆژ حەشـرت لەگەڵیایـە

ئـــەوەی باسـکرا بـــە روتـبـــە، دژیـــان بڕیـــاردە سووربـــە
ووریابـــە لێیـــان دووربـــە، ژیـــنـــت تـــاڵ دەکـــەن ژیربـــە

بـــرادەری چـــاك هەمـــانـــە، زۆر کـــەمن لـــەم زەمـــانـــە
بـــۆت بـــاس دەکـــەم کامیانـــە، باشـــە هـــاوڕێت بـــێ، گیانـــە

ئەوکەسەی تەنهاو تەنـهـا، لـەبـەر خـوای تـاك و تـەنـهـا
بـۆت دەبێ بـەهاوڕێ و بـرا، نـەك لـەبـەر نـیـازی دونـیـا

ئامۆژگـاری چـاك دەكـا، لـەخراپـە دوورت دەكـا
زمـانی لـێـت پـیـس نیـە، دەروونـی لـێـت ڕەش نـیـە

بەشـداری خۆشیـت دەكـا، غـەم لەسـەرت سوك دەكـا
چـاوی لەئابـڕووت نـیـە، پـارەی لاگـرنگ نـیـە

لەچـوونت غەیبـەت ناكـا، لەتـەنگی پـشـت هـەڵـناكا
كەنـەتبوو دابـڕ نیـە، كەهـەتبوو دەسـت پـان نیـە

چەشـنی ئـەم هاوڕێیانـە، پێویـستـن لـەم ژیانـە
دونیـا بەمانـە خـۆشـە، دەنـا تۆپێـكی بـۆشە

* * *

بـاجی بـرادەری باخـەڵ برسـێتی یـە
بـەد فـەڕو بـەدكار بـەر لە پیـسی یـە

# ئافرەت

ئافرەت وەك پیاو (إنس) ێكە لەژیان
هەردووكیان پێكەوە دەبنە ئینسان

سەرەڕای (إنس) ێكە ڕەگەزی (أنثی)
بۆ پیاو (أنس) ێكە هەروا (سكنی)

دەزانی گۆی زەوی بەچینێك پێچراوە
هەر میوە جاتێكیش بە پەلكێك پۆشراوە

ئافرەت پارێزراوە بەم سەرپۆشەی لەسەریا
بەوێنەی دوڕو لوء لوء وان لەقوڵایی دەریا

ئافرەت بەپێستێكی جوان خوا پۆشیتی ئێسقانی
تا ئەویش دایبپۆشێ ئەم پێستەی خۆی بەجوانی

ئافرەت وەكو مرواری دەبێ خۆی دایپۆشێ
تا پیاو هەروەكو كاڵا بەهەرزان نەیفرۆشێ

ئەوا كردگاری باری، بۆ هەر جنس و ڕەگەزێ
دایناوە ئەرك و كارێ، كە هەر بۆ ئەو دەگونجێ

وێــڕای ئــەم ئــەرك و كــارەش، مــافی زۆری پــێ دایــە
لەســـــەر پابەندبوونیـــــشی پاداشـــــتی زۆری لایـــــە

ئــافرەت لــەدین ســەنگینە، بۆیــە لــەماڵ دانــــراوە
بەوێـنــــەی زێـــڕو زیـــوە لەقـاســــە هەڵگــیراوە

پیـــاویش زبـــرو بـــەهێزە، بیرتـیــژو خۆڕاگـــرە
خـێـــزانی دەپارێـزێـــت مـانــدووە هــەم شـــاكرە

كەچـــی ئـــافرەت ناســـكە، شوشـــەیە پــڕ لەســـۆزە
دەریایـــــەك ئارامیـــــە، بەبـــــەزەیی و دڵـــــسۆزە

كارگــــەی وەبــــەرهێنان و پــــەروەردەكاری منداڵـــــە
پــشتگری پیاوەكــەیتی، هــەم سەرمەشــقی نێــو ماڵــە

هــەروەكو بــەهیچ پیــاوێ، منــداڵێ گــەورە ناكــرێ
قــەد بــەهیچ ئــافرەتێكیش تــونێڵێ لەشــاخ نــادرێ

هـــــەروەكو پێـــــشینانیش ووتویـانـــــە بـــــابە
نـــان بـــۆ نانەوایـــە و گۆشتیـــش بـــۆ قەســـابە

پیـــاو حـــەزی لەپۆشـــینی، درع و چـــەك و تیـــرە
بەئافـــرەت بـــێ بـــپۆشێ، هەرچـــی زێـــڕو حـــەریرە

**کەواتــــە گەمــــژەیی یـــە، هیـــــچ بنەمایەکـــی نیــــە**
**بڵـــێ ی ئـــەو وەکـــو پیـــاوە، یەکـــسانە فـــەرقی نیـــە**

**چـــونکە تـــۆ دەیـــشوبهێنی بـــەپیاوێ کـــە ناتـــوانێ**
**هـــەروەکو پیـــاو پیـــاوەتی، لەخـــۆی بـــەکاربهێنێ**

**ئەوانـــەی بەشـــەوو ڕۆژ، دۆڵ و زوڕنـــا لێـــدەدەن**
**بـــەناوی مـــافی ئـــافرەت، لاف و گـــەزاف لێـــدەدەن**

**گـــورگن لەپێـــستی مـــەڕن، نیـــازو مـــەرام گـــڵاون**
**جـــام ڕەش و جانتـــا ڕەشـــن، لەپێـــشدا ڕەش هـــەناون**

**مەرامیـــــان لەئـافـــــرەت دا، ڕابـواردنـــــی شـەوانـــــە**
**بـــەڕۆژیش بـــۆ ڕێـــکلامی، کاڵاکـــەی بازاڕیـانـــــە**

**بانگیـــان ســـەدای ســـحرێکە، فـــرت و فێـڵـــە لەچـــاوە**
**ســـەرابێکە لـــەدووررا، بـــۆ کەســـی تێنـــوو ئـــاوە**

**بەنجێکـــە بـــۆ بـــێ هۆشـــی و، دەردەدارکـــردنـــی ڕۆحـــت**
**تـــا بەکەڵبـــەو چـــڕنووکیان، ئـــەتك بکـــەن شـــۆخت**

**خوشـــکی بـــەڕێز زیربـــەوە، تـــۆ نـەکەویـــە داوی**
**کەســـێ کـــە دۆڕاوەو، بـۆگـــەن بـــووە هەنـــاوی**

تــــۆ لەســــەر ڕێبــــازێکی، نــــەفامیت ڕەتکــــردووە
پارێزکــاری ڕەوشــتی، ئــابڕووی خــۆت نــەڕشتــووە

* * *

ئـــابـــڕووی ئـــافـــرەت ئـــاوێنـــەی ئـــافتاوە(*)
ئـــاسۆی ئـــاسـودەیـــی لـــەئـــاودەمـــی(**) ئاوە

---

(*) ئافتاو : ڕۆژ ، شوشەی ئاو
(**) ئاودەم : هاوسەر
ئاودەمی ئاو : هاوسەرێکی پاك و تەڕ

# عەقڵ و بەنج

خـــــودای پایـــــه بـــــەرزی، پـاکـــــی بـــــێ وێـنـــــه
لـــەم قـورئـانـــه بەڕێـــزه، کــه عــەقڵ و بـیــر دوێـنـــه

بــەیانی کـــردووەو بـــاوه، ڕێـــزی لـەئـادەمــــی نـــاوه
لەنـێـو ئـــەم هـەمــوو بـوونـــه، ســەروەری هەر بەو داوه

لــەدوای نیعمــەتی ئیمـــان، بــەهرەی هــۆش و ژیـــری یــه
کـــەسێ درکـــی پـــێ نـــەکا، ژینـــی درکــه گـــوڵ نـــیه

قــەت شـێتێکت نـــەدیوه، لەســـــەر گوفـــەك کەوتبـــێ
خـۆراکی بـۆگـەن بخوا، خـۆی پـیس کردبێ و خەوتبـێ

خۆتـــۆ گـــەر ئـــەم دیمەنـــه، بەخـــەو بـــەخۆت ببینـــی
ڕەنـگـه شـێـت بـی ئـەو شـێـتـەش خـەو بـەژیریش نـابینی

دەســـا بزانـــه ئـــەو عەقڵـــه، چ بەخشـــشێکی خودایـــه
بـەتـــۆی داوه تـاکـــو تـــۆ، بـۆی بـــژی لـــەم دنیـایـــه

بــۆ پاراســتنی ئــەم عەقڵــەش، حــەددو ســنور دادەنــرێ
هـەرکـەس لایبـا بـەعــەرەق، هـەشــتـا جــەلدەی لێ دەدرێ

چــونکە نرخــی نیعمـــەتی، هــۆش و ژیـــری شـــکاندووە
خــۆی خــزانــتــە نێــو ئــاژەڵ، خــەڵکیش ترسیان لێ ی بوە

ســـەیرتر ئەوەیـــە کەســـانێ، بــۆ شــتی کــەمتر دەڕوانـــی
تـلـیـاك و حـەبـی بــێ هۆشـی، وەکــو ئــاژەڵ دەنــۆشی

تــۆی بــەڕێز بــۆ وادەکــەی، ژینــت بـــێ مـانــا دەکـــەی
خانەو خامەت خاودەکەی، هەرخۆت خـۆت خامۆش دەکـەی

بــیرت چـــووە موســـڵمانی، خـــاوەن پـــەیامی قورئـــانی
ئوممـــــەت چـــاوی لـــەتۆیە، ئـــەرکی ســـەرشانی تۆیـــە

هـــەوڵ و هیممـــەتێ بـــدەی، غـــەمی ســـەری لابـــدەی
بیـــرو بەرنـــامەی بـــەدی، بەبـــەردی ڕەق دابـــدەی

خوایـــە وابکـــەی هـــەرخۆیان، زوو بێنـــەوە هـــۆش خۆیـــان
یـــا یـــەکـــێ بنـــێرە بۆیـــان، ڕێ نیـــشاندەربێ بۆیـــان

تــۆ هزرێکیــان پــێ بـــدەی شــت وەکــو خــۆی ببینـــێ
بەهـــەواو ئـــارەزووی بـــەدی، ڕەش و داپۆشـــراو نـــەبێ

چــۆن ڕەنگـــە جیاوازەکـــان، بـەچـــاو جیـــا ئـــەکەنـــەوە
بــە عــەقڵیش پــاك لەپیـــسی، هاوێـــرو جیاکـەنـــەوە

* * *

کــــەتــــۆ هزرت هۆیەی هاری و هەرا یێ
هـــــەولی هۆش دە با هاودەمت هودایێ

# کات

گەنجینەو سەرمایەکانی تەمەنت
چرکە ساتەکانی مان و ژینە
ناوو ڕەنج و بواری بوونت
ترپەی دڵی پڕ خوێنینە
* * *

چەندین کەس هەبوو لەڕابردوودا
لەئێستاش و هەم لەداهاتوودا
لەمەوبەر هاتووە و دێتە دونیا
نازانێ حیکمەت چیە لەبونیا
* * *

تەمەنی زێڕینی وا بەزایەچووە
ڕۆژێ بەخۆی خۆی نەدواندووە
هاوار تا ئێستا من چیم کردووە ؟
کات و ڕۆژانم چۆن بەسەر بردووە
* * *

دەڵێن کات وەکو تیرو شمشێرە
تیژەو هەمیشە بە تەمبەڵ فێرە
ڕۆژێ بەهەزاران لەوێ و لێرە
دەبنە قوربانی ئەم کەڵە شمشێرە
* * *

هەرچی دەبینم لەئێمەو مانە
زۆر جێگەی سەیرو سەرسوڕمانە
سەعاتی گرانبەها وا لەدەستمانە
کوشتنی کاتیش پیشەو ئیشمانە

* * *

داربەداری دامەو پولی دۆمینە
خۆ کوشتنە یاخود دووشەش تۆپینە
لەمانە خراپتر تاولەو ڕازە
حەڕامە وەکو گۆشتی بەرازە

* * *

خراپتر لەوەش دۆبلازی فەڕەنسی
هەوێنە بۆ زیناو داوێن پیسی
هەروا زنجیرە زەڕە تورکیەکان
ڕووخێنەرن بۆ بەها چاك و پاکەکان

* * *

بەگەعدەی قومار دەورە دەنیشن
بێزاخ و بێزار بێ پیشەو ئیشن
نێرگەلەو جگەرەی لەسەر دەکێشن
لە حي الصلاة بێ پشك و بێ بەشن

* * *

پاشان لەسەری مەستی خەست دەبن
لەم شەوە درێژە قەلس و پەست دەبن
ئینجا لەخەودا ڕەق و کپ دەبن
بۆکاری خراپە، بەیانیش ڕشت دەبن

* * *

کــــــه بــــــەها بــــــەرزەکان لەنێــــــومان نـەمـــــا
هــــــەرماڵێك لەخۆیــــــدا دەبێتـــــــه سینـەمـــــا
کــــاتیش دەکـــــوژرێ بەشـــــتی بـــــێ مـەعــــنا
هەرچــــــی چــــاکەیە دەدرێتـــــــه بــــــەر تەعنـــــا
* * *

هــــاوار لــــــەم ڕۆژەی شـــــینه نــــــەك شــــایی
کاتـــــــی ڕاگـیـرانـــــــت لـــــــەڕۆژی دوایـــــــی
پرسیــــــارت لێ دەکـــــــرێ لەتـەمـــــــەنی زایـــــــی
لەچـــــیت بــــــەڕێ کــــــرد گـەنجـــــی و بــــــەرایی
* * *

ئـــــــەوسا دەزانـــــــی تەمـــــــەن چـــــــەند کورتـــــــه
کــــات تـــــۆی بڕیـــــوەو بڕینـــــت چـــــەند ســــەختە
ئـــــەوکات چـــــی دەڵــــــێ ی داوای چـــــی دەکـــــەی ؟
بـــــەڵێن دەی لــــــەدونیا هـــــەقی کـــــات بـــــدەی ؟
* * *

هەیهاتـــــــه هـــــــەیهات شـتـێـــــکی مـەحـاڵـــــــه
تـــــۆ کاتـــــت هـەبـــــوو داواکـــــەت بـەتـاڵـــــــه
* * *

بەکارنامە کار لەکات بکە تا لەکاروان کاهێڵ(*) نەبی
کرۆك پاك بە بۆ کردگـار بـۆ کـافر کاوێژکـەر نەبـی

(*) کاهێڵ : تەمبەڵ

# نوێژ

نوێژ هەقی خوایە لەسەر بەندەکان
فەرزو واجبە لەسەر هەموومان

تاکە ڕوکنێکە فەرزکرا لەئاسمان
دووەم ڕوکنیشە لەدوای شایەتمان

لەبەر گرنگی و گەورەیی پلەو پۆی
خوا خۆشەویستی بەرزکرد بۆلای خۆی

تا لەم مەقامە بەرزو بەڕێزە
پێمان خەڵات کا پێنج فەرزە نوێژە

هەر لەم سەفەرەی بەڕۆح و لاشە بوو
لەوەی کەبینی بەهەشت و دۆزەخ بوو

هەروەك ئامازەك بۆ هەر کەسێکە
چارەنووس لەم فەرزە تەنها یەکێکە

کەسێ ئەنجامیدە بەدروست و دڵسۆزی
بەهەشت جێگەیتی و لێ ی دەخوا ڕۆزی

گــــــەر وازی لێ هـێـــــناو نــــــەیکرد بەجـــــارێ
دۆزەخـــــــە شـوێـنــــــی و لـەنـێـــــو ئـــــازارێ

چـــونکە شـــوێن و پایــــەی، نوێـــــژ لـــــە ئایینـــــدا
وەك پایـــــەو شوێـــــنی، ســــــەرە لـــــە لەشـــــدا

کۆڵەگـــــــەی پتــــــەوو، دیـنـگـــــــەی دینــــــــە
هــــــەق فـەرمـایـــــشتی، ڕەســـــولی ئـەمـینـــــــە

کەســـــێ نـوێـــــژ نـەکـــــا کۆڵگـــــەی شـــــکاوە
سـەقفـــــی دیـنـەکــــــەی بەســــــەردا ڕوخــــــاوە

کـــــە جێگــــــەو لانــــــەی، نـەمـــــا لـەنێومـــــان
دەکەوتـــــــە بـــــازنەو ڕیـــــزی بــــێ دیــــــنان

نـــــوێژ پەیـــــــوەندی بەنـــــــدەو خوایـــــــە
ئـەوخــــــوایەی کـــــەوا بـــــەدی هـێـنـایــــــە

گەورەتـریـــــــن هــــــــەق و مـــــافی خودایــــــە
گـــشت گـــەل و کەســـێ فـەرمـانـــی پـــێ کـــرایە

نـاسنامـــــــــەو بـەڵگـــــــەی موسڵمانـەتیــــــــە
کـرۆکـــــی دیـنــــــداری و هــــــەم بـەنـدایـەتیـــــە

پـایـــــەو مەقامـــــی شــــەڕەف مـەنــــدیە
پــــڕ لــــە ملکەچـــی و خۆشەویــــستی یـــە

نیـــشانەی دڵ پــاکی و بــێ خەوشـــی دمروونــە
بـەگـــەورە گـرتـنـــی پـــەرومردگاری بـوونـــە

دڵ ئـاومدانــــــەو ڕۆح بـــــــەرزە فـــــڕە
دوور لـەجەنجـــــاڵی و ئـــــاگرو گـــــڕە

چـــاكترین كـــرداره پـــێ بۆخـــوا زەلیـــل بـــی
باشـتـــرین هـــۆكاره پــێ لەخـــوا نـزیـــك بـــی

نوێـــــژ ئاســـــانە، بـــــۆ ڕۆح دەرمانــــــە
لەســـــــەر دووڕوو وەك قـورِكـێــــــــشانە

كەســـێ نوێـــژ نـــەكا خـــۆی ســـووك دەكـــا
پەیـومنـــــدی لـــــەگەڵ شـــــەیتاندا دەكـــــا

چونكـــە وەك شەیتـــان پـــۆزو فیـــزت كـــرد
بـــۆ خـــوداى (عـظیـــم) ســـوژدەتان نـەبـــرد

خـــۆتان ڕوو ڕەشـــی دونیـــاو دوا ڕۆژكـــرد
لەغـەیـــری خراپـــە هـــیچ خێرتـــان نـەبـــرد

نوێژ غەم ڕەوێن و هەتوانی برینە
کەسێ خولیای بێ شادو گەش بینە

بەختەوەر دەبی، تۆ دەروون گەشی
لەخێرو پاداشت، پشکی شێر بەشی

دەسا تۆ قەدری ئەم هەلە بزانە
خۆت لێ بێ بەش کەی ژینت هەر ژانە

کەواتە ئەم پایەی بەهەق پێدراوە
پاداشتی زۆریش لەبەهەشت دانراوە

چونکە لەنوێژدا ئاخاوتن دەکەی
لەگەڵ پەروەردگار گفتوگۆ دەکەی

ووتەی خودا بۆتۆ، خوێندنی قورئانە
ووتەی تۆ بۆخودا، زیکرو دوعانە

گەر هەر نوێژ نەکەی، نکوڵی بکەی
گومڕاو کوێرانە، لاسایی کێ دەکەی ؟

لاسایی ئیبلیس، بەدکارو موفلس
دوور لەڕەحمی خوا، بێ بەش و موبلس

گەمــــزەو بـــەد بەخـــتی، نابـــوت و نـــاپیـــاوی
بـــۆ ئـــــەم شەڕەفــــە بـــێ بـــەش و نـــەشـــیاوی

پێویـــستە لەســـــەرت لەعنـــەت لــــە ئیبلـــیس کـــەی
بـــەلاســـــایی کـردنـــــــی خـۆشـحاڵـــــی نـــــەکەی

هـــــەر ئێـــــستا بڕیـــــاردە، مـەیخــــەرە سبـــەی
ڕوو لــــــەخوا بکـــەی، هەتـــــا هـــــەی نوێـــــژ کـــــەی

بڕیـــــارت تەوبەیـــــە، تـەوبـــــەی خـــــوا ویـــستی
لــــەگوناهت خـــۆش دەبـــێ و دەبیـــە خۆشەویـــستی

بـــۆ حـــيَ علـــى الـــصلاة وەڵامـــــت هـــــەبێ
لـەکاتــــــی خــــــۆیدا، بـــــا نـــــویژت کـــــردبێ

کــــــە وەستـــــای بـــــەرەو، ڕووگـــــەی کەعبــــــە
پێـــــشتـر بـــــەرووی دڵ، ڕووبـــــــەرەو خوابـــــــە

دڵ و دەروونـــــــــت بـــــــــەهزرت کۆکـــــــــەوە
لەوەســـــتانی حەشـــردای، بـــــەم شێـــوە بیـــرکەوە

بەهەشتـــــت لای ڕاستــــــە، ئـــــای کــــــە ڕازاوەیـــــــە
لای چەپیــــــش دۆزەخ، وەی کـــــــە نەکوژاوەیــــــە

شوێنی سوژدەکەت بکە نیشانە
بۆ چەپ و ڕاستت هەرگیز مەڕوانە

وابزانە گۆڕەکەت، لەپشتت لێ دراوە
دەچیە ناوی، ئەم نوێژەت ماوە

وادانێ ئەم نوێژەش، نوێژی کۆتایە
با چاکترین نوێژت بێ بۆ ئەم خودایە

الله أكبر، تەکبیرەی ئیحرامە
هەر قسەو جوڵەیەك، لەمتۆ حەڕامە

چونکە ئێستا تۆ، وەستاوی بەرامبەر
پەروەردگاری خۆت، خالقی بەحرو بەڕ

بەدوعای کردنەوە، وێردت بخوێنە
بەسورەی فاتیحە، خالقت بدوێنە

بەدڵێکی بێدار، بخوێنە قورئان
خۆت ئاوێتەکە بەنێو باسەکان

بەدەنگ و ئاوازێك، هێواش بخوێنە
غەم و تاریکی، دڵ پێ بڕوێنە

بەکـــــڕنۆش بـــــردن و چـــــەمینەوە بــــۆ خــــوا
ڕەتکــــەوە ملکــــەچ بـــی، بـــۆ یاســـــای نـــــارەوا

بۆخــــوا ســـــوژدەبە، بــــۆی بــــەڕودا بکــــەوە
چـــی پێویـــستیت هـــەیە بـــۆی بـــەرز بکـــەوە

پـــــەیمانت نـــــویٚ کـــــەوە، بەخوێنـــــدنی تـــــەحییات
شـــوێن کەوتـــەبی تاهـــەی، بـــۆ تاکـــە پێـــشەوات

پەناگـــــــرە بەخــــــوا، لـــــەسزای نـــێو گـــــۆڕ
هـــــەروا لــــــە دۆزەخ لــەئـــــاهو ســـــزای زۆر

ئینـــــــجا لەفیتـــــــــنەو، ناخـــۆشـــــــی مـــــــردن
لەزیندووبـــــــــونەوەو زنـــجیـــــــری گــــــــەردن

یەکـــــــەم پرسیـــــــاریٚ، لـێـــــــت دەکــــــریٚ دواڕۆژ
دەربـــــــارەی نـــوێـــــــژە، هــــــــەموو شــــــەووڕۆژ

جاگــــــەر نوێــــــژەکەت، پـــــاك و تـــــەواو بـــــیٚ
کارەکانـــــی تریـــــشت، چـــــاك و ســــووك دەبـــــیٚ

خـــــــۆ ئەگـــــــەر نوێـــــــژت، کەموکـــــــوڕداربیٚ
هەرکارێکـــــی تـــــرە، خـــــراپ و گـــــران دەبـــــیٚ

کەسەلامـــــــت داوە، دڵــــــت شـــــاد دەبـــــێ
بـــــۆ نوێـــــژی دادێ، چـــــاوەڕوان دەبـــــێ

ئـەمـــــەو چـــــەندین، ســــــوودو بــــــەری تـــــر
ڕەزامەنــــــدی خـــــواش، لـەهەمـــــووان خۆشـــــتر

ئـــــەم چـــــەند دێـــــڕەی، لەبـــــاس و هۆنـــــراوە
دڵۆپێکـــــە لـــــەدەریای، بـــــەهای نوێـــــژ ووتـــــراوە

باشتـــــرین ووتـــــەش، کـــــە هەقـــــی یەقیـــــنە
فەرمایـــــشتی خـــــوای ئـاسمـــــان و زەمیـــــنە

هـــــەروا فەرمـــــوودەی، پێـــــشەواو ڕابـەرمـــــان
کـــــە هـــــەردوو دەقـــــن، بـــــۆ بناغـــــەی دینمـــــان

* * *

کەنێوچـــــەوانت نووســـــاند بـــــەنزمایی نـــــاوازە
کـــــەنزاو ناڵـــــەت نـــــارد بـەنـاخێـــــکی تـــــازە
نزیکـــــی و نمـــــرەی نـــــوێ لـــــەم نوێـــــژەدا بخـــــوازە

## دوو ڕووی دوێنێ و سێ ڕووی ئەمڕۆ

وا بەپشتیوانی خوای تەنها لەژێر ڕۆشنایی یەك چرا
چراو ڕوناکی شەریعەت بەمانای قورئان و سوننەت

★ ★ ★

چەند نیشانەو خەسڵەتێ کە دوو ڕووی پێ دەناسرێ
بۆت باس دەکەم بەکورتی تا نەبیە زاڵم و شورتی

★ ★ ★

سەرەتای سەرهەڵدانی دوو ڕوویی و دەغەڵداری
لەدوای کۆچی پیرۆز بوو لەبۆ شاری دینداری

★ ★ ★

ڕابەر دەوڵەتی دانا بەدەق و پەیڕەوکاری
بووبە ساباتی ڕەحمەت بۆمان دابەزی بەدیاری

★ ★ ★

ئیسلام شکۆمەند داربووهەڵکشا بەرەو لووتکە
هێزی بەهێزی دانا فەرمان درا کوفر قووت کا

★ ★ ★

هەرکەسێ لەمەدینە لەسەر هەر بڕواو دینە
ئەرك و مافی بۆ دانا بۆ ڕێکخستنی ئەم ژینە

★ ★ ★

کەسانێك کە کافربوون دونیا ویست و ترسنۆك
لەترسی سەرو ماڵیان بۆئیسلام کەوتنە سەرچۆك

★ ★ ★

بەڕواڵـەت موسڵمـان بـوون لەناخـیش کـوفـر بـەخـوا
دڵیـان پـڕ لـەگومانەکۆیلەن بـۆ نـەفـس و هـەوا

★ ★ ★

دنیـا لای کـێ ببینـن هەنگاویـان بـەڕووی دەڕوا
بۆیـە دەبنـە کاسـەلێـس بۆگـشت پـوچ و نـاڕەوا

★ ★ ★

خەریکـە قورئـان هـەمـوودەرباره یـان بـێ هـەموو
چونکە ژیانیـان هەرهـەمـوو خـزمـەتـە بەگـاورو جـوو

★ ★ ★

بـراو دڵـسۆزی ئـەوانن پـشت و پـەنـاو پـیلیـانـن
هاوخـەم و هـاودەمیـانـن شۆڤـارو شەڕڤانیـانـن

★ ★ ★

کاتـێ جەنـگ و جیـهادێبۆ بـاوەڕدار دێتـە ڕێ
ئـەوان دڵـیـان دەلەقـێ ڕەنگـی مـردوویان بـەسـەردێ

★ ★ ★

چـەنـد نـەزانن وابزانـن خـوایـەو بـاوەڕدارانن
هـەڵ خەڵـەتاوی ئەوانـن بەڵکـو خـەڵـەتـاو خۆیـانـن

★ ★ ★

بـەدرۆ و چـەندین بەهانـە وون دەبـن وەك مۆرانـە
خـوا ئاگـای لـەدڵـیـانە نـیازیـان بـۆمان بەیانـە

★ ★ ★

دەڵێـن ماڵـمانـە بـەتاڵە خـاو و خێـزان و مـناڵـە
گـەرەکی پیاوێکـی زاڵـە پـارێـزگـاربێ لـەم ماڵـە

★ ★ ★

یـا هـاویـنـــه و لـه‌گه‌رمـــان ده‌رچـیـــن داخ ده‌بـــێ ســه‌رمـــان
ئـاگـــری دۆزه‌خ بـــۆ ئـــه‌وان گـه‌رمـتـــره گـــه‌ر بفامـــان

★ ★ ★

ده‌ڵێن ده‌رچوون فـیـتـنـه‌یـه ترسمـان لـه‌هـه‌ڵاتـــن هـــه‌یه
ئـــه‌ویش گونـــاهی گـــه‌ورمیه خـــوا لـــه‌م کـــاره تورمیـــه

★ ★ ★

هـــه‌ر ئـه‌ســـاس تـرسـنـۆکـــن لـــه‌ڕووی دوژمـــن له‌رزۆکـــن
خۆشـحاڵی ژێـــر چـه‌پۆکـــن لـه‌م کـــارانه پـه‌شۆکـــن

★ ★ ★

چـه‌نـد بیانـو بهێننـــه‌وه تـه‌نها بـۆئه‌وه‌ی بـمـێننـــه‌وه
وه‌کـو پیـــاوان نـه‌جـه‌نـــگن وه‌کـو ئـافـــره‌ت بله‌نـگـــن

★ ★ ★

قه‌لـــس و بێـــزارو پـه‌ســتـــن گـــرژو غـه‌مگیـــن و غـــه‌مبار
له‌هـه‌ر شوێنـــێ ببیـــســتـــن بـــه‌رزه به‌یـداغـــی دیـنـــدار

★ ★ ★

خـــۆ هـه‌رکاتـــێ بینیـــان دینـــدار له‌ســـه‌ر دینیـــان
بـــه‌ش مه‌ینـه‌تیـــه ژینیـــان ده‌رده‌بـــڕن خۆشحـــاڵیان

★ ★ ★

بـــێ ڕێـــزی و ســوکـایه‌تـــی بـه‌دیـــن و به‌ندایـــه‌تی
کـارو پیشـه‌ی ڕۆژیـه‌تـی هیـچه‌و کێـشه‌ی هیـچیـه‌تـی

★ ★ ★

هه‌ر له‌سه‌ره‌تا تائـه‌وسه‌ر دوانیـــان درۆیـــه بـــێ ســه‌روبـــه‌ر
هیچ په‌یمانێك نابه‌نه سه‌ر له‌ســپارده‌ش هـه‌ر خیانـه‌تکـه‌ر

★ ★ ★

دەبوا لەبەر گوناهو سەرپێچی و کەم و کورپیان
هەمیشە پیشەیان بێ غەمگینی و بەکول گریان

★ ★ ★

کەچی لەگاڵتەو گەپ و شیرەی پێکەنین یاندا
بەم لاو ئەولادا دەچن مەستن لەبێ هەستیاندا

★ ★ ★

برایەتی و هاورێیەتی تەنها لەبەر دونیایە
بۆیە هەرکات پچڕاندی زۆر بەخراپ تێکی دایە

★ ★ ★

زۆر کەم یادی خوا دەکەن نوێژەکانیش دوا دەخەن
لەدواساتدا ڕادەکەن چوار دەنووك لەخاك دەدەن

★ ★ ★

نوێژیان زۆر لەسەر قورسە دڵیان پێ گران و قەلسە
دەچنە مزگەوت بەهۆسە بۆ تەفرەقەو بۆ بۆسە

★ ★ ★

دوو نوێژ لایان زۆر گرانە نوێژی بەیانی و خەوتنانە
شاخێکەو بەکۆڵیانە شادی و خۆشی بەریانە

★ ★ ★

کەخوا پێیان ببەخشێ بێ شك دەستیان دەقونجێ
بەدرۆو بوختانیان نەبێ مان و بوونیان ناگونجێ

★ ★ ★

زەکاتی ماڵیان دەربکەن خەریکە دەمرن ڕۆح بدەن
توانج لەهەژاران دەدەن بەدرۆزن ناویان دەبەن

★ ★ ★

کە جیهادو جەنگ نەما ترسیان لەکوشتن نەما
زمانی تیژیان لەبەزما شمشێری باشە بۆ سەما

★ ★ ★

فەرمان هەر بەخراپ دەکەن رێگری لەچاکە دەکەن
بەرۆژ وورگیان پڕدەکەن شەو کەلەشیان پەك دەخەن

★ ★ ★

سەرکەش و پۆزو بوغرا ناچنە ژێر حوکمی خودا
مەگەر شتێك لەم بەینا بەدەست بێنن ساقەینا

★ ★ ★

لەکێشەکان نابوتن وابەستەی رێ ی تاغوتن
یا هەڵاتووی تاڵووتن یا جەندرمەی جالوتن

★ ★ ★

حوزەیفەی کوڕی یەمان هاوەڵی پێغەمبەرمان
دوو ڕووانی سەردەمی خۆی خراپتر زانیوە لەپێش خۆی

★ ★ ★

ئێستا سێ ڕوویان هەیە پلەدارن پارەیان هەیە
بەڕوویەك خەڵك خەڵەتێنن خۆیان بەعومەر دەچوێنن

★ ★ ★

بەڕووێك دیموکرات خوازن ڕۆشنبیرو نوێ خوازن
بۆ ماسۆنیەت ئامرازن بۆ ژن وێنەی بەرازن

★ ★ ★

بەڕووەکەی تر یەهودن پەیرەوکاری تەلمودن
بۆئیسلام زۆر حەقودن ژێر دوژمنی لەدودن

★ ★ ★

پێـــشرەوی زۆردار دەكـــەن موسـڵمـــان ئـــازار دەدەن
بـەقەڵــەم هــەواڵ دەدەن پیـاوچـاك لـەزیـندان دەكـەن

★ ★ ★

جاگـەر دۆزەخ بـۆ ژنـێـكەلەسەر بەنـدكردنی پـشیلـەیـە كـە
ئەمانـە دوارۆژ چـی دەكـەن كـە زانـایـان بەنـد دەكـەن ؟

★ ★ ★

بڕیاری (أحكـم الحـاكمين) ە شـوێنیان (أسـفـل الـسافلين)ە
جابزانــە چــەند شـیـریـنــە بــەری داری ئــەم دینــە

★ ★ ★

پێـشتر نوێـــژی بەیـــانی بـــۆ مـــزگەوت هەڵنـەدەستـــا
ئێـــستا بـــۆ ڕاپۆرتـەكـــەی ڕیـــزی پـێـــش داگـیر دەكـا

★ ★ ★

پێـشتر نوێـژیان دوا دەخـست لەكۆمـــەڵ دوا دەكـەوتـــن
ئێستا پـێش كـەوتن خـــوازن لایـــان عـەیـبــەو دواكـەوتـــن

★ ★ ★

پـێـــشـتــر هــەر بەنـهـێنی بەكـوفــرو كـافری هــەڵدەدا
ئـیـــستا بــەڕێ ی ئـاسـمــانی كـــوفری نـاخـــی دەردەدا

★ ★ ★

بـەدەستـــووری ڕۆژئـــاوا ســـێ چـــارەك لەبـــەر دەكـــا
بەسـەرپـێـــچی پـێـــشـەوا تـــانە لەجـــلی كـــورت دەدا

★ ★ ★

ســـەگ ســووك دەهـێـڵـتـــەوە لاســایی زۆڵـــی تـەكـساس
ڕیـــشی پیـــرۆز دانـانـــێ هێمـــای پـــیاوە لـــەئەساس

★ ★ ★

بۆ هەر بەلگەك لەسەر خوا گومان بۆخەلك دروست دەكا
بۆماڵی جاڵجاڵۆكە فوو لەدەبدەبە دەكا

★ ★ ★

لەگەڵ گشت دوژمنێكا هاوپەیمانیەتی هەیە
لەرزۆكی ئومێد بەرن كێ توانای غەربی هەیە ؟

★ ★ ★

دەڵێن چاكسازی گشتین خەمخۆری دەرودەشتین
رزگاربووی تاقە كەشتین لەدوا ڕۆژیش بەهەشتین

★ ★ ★

كاتی خۆی بەپێغەمبەر ووتیان هەرتۆی پەیامبەر
خودا فەرمووی بەخەبەر ئەوانن درۆزنی بەدفەڕ

★ ★ ★

دەكەواتە باوەڕدار ئاگاداربە ئاگادار
ئەمانەن دوژمنی غەددار پێت وەنەدەن چەشنی مار

★ ★ ★

با قورئانمان بخوێنین لەماناكەی ڕامێنین
پێویست ناكا دامێنین باشەو لەخۆ بتارێنین

★ ★ ★

دڵی دووڕوو پڕ داخ و درۆیە
دێوانەی دونیاو دڕندەی درۆیە

# باران

ئـــاو بەخـشـــشی خودایـــــە  بۆمـــــان بـــەدی هێنایـــــە

هـــەر لەئاویـــــشا ژیانـــــی  بەهـــەر هـــەموو شـــتێ دایـــــە

★ ★ ★

ئـــــادەم گـــــیراوەی گڵـــــە پـاشـــــان بـــــە گـــن فێگـــون

وەچـــــەو نـــەوەکـانیـــــشی لـــــەئاوێ هێنایـــــە بـــــوون

★ ★ ★

بـــاران چـــەتری ڕەحـمەتـــــە بەڕەحمـــەت نـــاوی هـاتـــووە

ئـــەو هـــــەورەی لەسەرمـــــانە ســـەرچـــاوەی ڕۆزی بـــووە

★ ★ ★

بـــاران هۆکـــاری ژیـانـــــە بۆخـــاکی ووشــــــك و مـــــردوو

خـــاکیش خەزێنـــەی خــــۆراك  بـــۆ ئێمـــەو هەرچـــی زینـــدوو

★ ★ ★

خـــوا لـــەهەمـــوو دەریـایـــێ  ئـــاوی زوڵاڵمـــان بـــۆ دێـنـــێ

بـــا دەیـهێـنـــێ و دەبـــارێ  لـــەخاك کـانـیـــاو دەردێـنـــێ

★ ★ ★

کـــــە مـیکـــــائیل تـایبـەتـــــە بـــــــە باوبـــــاران و ڕۆزی

جـبـــرائیـــــل وەحـــی هـێنـــە ڕۆحــــە بـــــۆ مـــــرۆڤی زەوی

★ ★ ★

کـــــە ژیـانیـــــشت تـــەواو بـــوو ئێـــستا زیـنـــدوونی مـــردوو

(ملـــكُ المـــوت)ت دێتـــــەسەر  مـــۆڵـەتـــت نـــادا بەمـــــوو

★ ★ ★

ئیسرافیل چاوەڕێ یە دەمی بەکەڕەنا نایە
کەفووی گرد زیندوو دەبێ هەرچی وا لەگۆڕدایە

* * *

ئەمەیە نهێنی باسی ئەو مەلائیکانەی تایبەت
ناویان هاتووە بەزۆریهەم لەقورئان و سوننەت

* * *

هەریەکیان بەئیزنی خوا ژیان دەبەخشێ یا دەیبا
ژینت کاتە بەنرخە بەفیڕۆی مەدە عەیبا

* * *

باران بەزەیی یە بۆ بوژانەوەی بوونەوەر
بزەو بازاڕی بێ خەمی یە بۆ بێواری(*) بەختەوەر

---

(*) بێوار: هەژار

# لا إلهَ إلاّ الله

کەس پەرستراوی هەق نیە تەنها (الله) هاوتای نیە
ژیانی ڕۆحە ئەم ووشەیە هەروەك ڕۆح ژیانی لاشەیە

★ ★ ★

ئاسمانەکان و زەوی لەپێناو دروست کراوە
ڕاستەقینەی ناسینی لەهەموو ناخێك چێنراوە

★ ★ ★

بناغەو بنج و بنەڕەتی قەبول بوونی ئاینە
تاکە ڕووگەی تایبەتی خەڵکانی سەر زەمینە

★ ★ ★

لەپێناو ئەم ووشەیە پەیامبەر زۆر نێردراون
چەك و شمشێری جیهاد بەڕووی کافر کێشراون

★ ★ ★

ئەنبیاو ئەولیائەکان هاوەڵان، چەوسێنراون
ئازاردراون بەندکراون دەربەدەرو شەهیدکراون

★ ★ ★

مافی گەورەی خودایە بەسەر گشت بەندەکانی
کەسێ بیڵێ بەکردار پارێزراوە سەرو ماڵی

★ ★ ★

ڕزگارکەری بێژەرە لەسزای گۆڕو ئاگری
تاکە پەتی گەیەنەرە بۆ بەهەشت لەئاخری

★ ★ ★

لەلا پەرەی دلا بەلاو لاو لکێنراوی
لەززەتم لە لوتکەیە گەر لەتکرێم لە پێناوی

# سۆزی نیشتمان و زۆڵی ڕۆڵەکان

چـــی بکـــەم لـــە ڕۆڵـــەی ئـــەم کوردستـــانە
کـــە بـــێ وەفـــا بوونـــە بـــەم نیـــشتـمـانـە
وڵـــات بـــۆ بیـانـــی سـەیرانگاو خـــۆشی یـــە
بـــۆ دڵسـۆزانیـــشی ئەشکەنجـــەو زینـدانـــە

ئـەمـــڕۆ ڕۆڵـەکـــان دەســـت و پـــێ خـــاون
هـــەروەکو جـــاران دڵـــسـۆز نەمـــاون
خولیـــای بـــێ هۆشـــی و بـــەزم و تـاوانـــن
کڕیـــاری کـــاڵاو فـرۆشـــەری خاکیانـــن

بەکانـــی سازگـارودیـمەنـــی دڵـڕفـێـــن
سەرسامیـــان دەکـــەم تـــاکو بـــۆلام بێـــن
نـەخـــشی کـردگارلـــەمندا ببینـــن
گـــەر خـــاوەن دیـــدو دڵـــی سەلیمـــن

* * *

بـــەرزی و شـکـــۆی شاخـەکانـــم
بـــەفری سپـــی لـوتـکـەکـانـــی
بازنـــەی گـــردو تـەپـۆلکەکانـــم
چـــەوو نـــشیوو دۆڵەکانـــی
بـــۆ هێـــزو بـــەرزی ئـێـــوەنە
کەچـــی ئێـــوە وەك کۆیلەنـــە
کڕنـۆش دەبـەن بـۆ دوژمنەکانـــم

ئــــەم خـــاکە بــــەهاران پــەیـــام دەنێـــرێ
بــەبـــــەرگی ســــەوزی ئـافـــرەت دەدوێنـــــێ
گـــەر وەك مـــن پێـــت خۆشــە نرخـــت زێـــر بێنـــێ
پۆشـــاکی حەشمـــــەت بـەبـــالاَت بمێنـــــێ

★ ★ ★

دارو درەختـــــە بـاڵاکــــانم
قـــەدو پــەلك و سێبـــەرەکانی
گـیـــاو پنجـــە سەوزەکانـــم
قـاچـــك و لاسکـــە ناســـکەکانی
بـۆجـوانـــی و شـۆخـــی ئێوەمـــە
بـــەڵام ئـێـــوە وەك دێومزمـــە
ناختـــان ڕەش کـــرد بـــۆ ناحـــەزانم

هێمـــــای ژیـانــــە پۆشاکــــی ســـــەوزم
خـــــەڵاتی خوایــــە پێـــــی ســـــەربەرزم
کـــــەسێ ســـەیرم کـــا بـــۆی شـــادی هێنـــم
بـــۆ هۆشمـــەندو زیـــر وانـــە پـــێ خوێنـــم

★ ★ ★

دەریاچـــە شـــین و ڕووبارەکانــم
جۆگـــەو کانیـــە سازگـارەکـــەی
مێـــرگ و باخـــچە ڕەنگینـــەکانم
مـــێش و هەنگوینـــە پاکەکـــەی
بـــۆ ســـوود و خـۆشـــی ئـێومیـــە
حەیفـــە ســـەرتان کلکـــی ســەیـــە
بۆمـانـــــەوەی داگیـرکــــەرانم

نیـــــشتمان پەســـــت و قەلـــــس و بێـــــزارە
لەسایـــــــــــەی هەرچـــــــــــی زۆڵ و زۆردارە
پـــــشتیان بـــــۆ دوژمـــــن حەمباڵـــــی بـــــارە
ڕۆڵـــــەی دڵـــــسۆزیش نامـــــۆن لـــــەم شـــــارە

* * *

ئـێستا نـیشتمان لاشـەی بـێ گیانـە
دڵەکەی وەستاوە بـێ تـرپـەو ژیـانـە
غەمبارو زەبوونە بەدەست بێگانـە
لـەدەسـت نـاپـاکـان زۆر هەراسانـە

> لەسایەو سێبەری ساباتم لەسپێدەی سپی دا بێ هەستی
> سەرتا پای سەرو بەندت سەرگەردانـی و سـەرمەستی

# تەڕاییەك لەدەریای زانستی خواو بەئاگاییەك

بـــــــەر لەدروســـــــت كـــــــردنی بوونـــــــەوەر
بـــــــە پەنجـــــا هـــــــەزار ساڵـــــــوەگەر
زانـــــــستی هەبـــــووە خـــــوای خەبیـــــر
بـــــــە هەرچـــــــی دەبـــــــێ بەتـــــــەقدیر

★ ★ ★

هەرچـــــــی هەیـــــــە لەئاسمانەكـــــــان
یـــــا دێتـــــە خـــــوارێ بـــــۆ سەرمـــــان
یـــــا هەرقـــــــسەو كردارێكمـــــــان
بەرزببێتـــــــەوە بـــــــۆ ئاسمـــــــان

★ ★ ★

لەهـــــیچ كارێكـــــمان بـــــێ ئاگـــــا نیـــــە
هـــــیچ كـــــون و پەنایـــــەك لـــــەو پـــــەنهان نیـــــە
چـــــۆن دەشـــــێ كەچـــــاوی پێـــــت بەخـــــشیە
تـــــۆش وابزانـــــی چـــــاوی لێـــــت نیـــــە

★ ★ ★

هەرچـــــــی لەنـــــاخ و ســـــەر زەمینـــــە
لـــــــەدار لـــــــەبەرد لەگەنجینـــــــە
چـــــەندە، چۆنـــــە، شوێـــــنی كوێیـــــە
تەنهـــــا خـــــوای زانـــــا عیلمـــــی پێیـــــە

★ ★ ★

ئـــــەو شــــاخانەی وەك مــــێخ و سـنگــــــە
پارســــنگی زەوی یــــە چـەنــــدە گرنگــــە
لەئاســــــتی زەوی چەنــــــدە لـەســــــەرێ
چـــــەندیش بـەنـاخـــــی چـــۆتە خـــوارێ

★ ★ ★

گـــــــەردو تـــــــۆزی بـیابانــــــــەكان
چەوڕێـــــــژو بــــــــەردی دۆڵەكـــــــان
نەخــــشی جـــوان و ڕێـــــژەی تــــــەواوە
ئـــــــەندازەی ووردی بـــــــۆ دانـــــــراوە

★ ★ ★

خــــودای كردگــــار بەئێمــــەی فــــەرمووە
هەرچـــی لەبوونـــە دروستـــم كـــــردووە
كـــێ هەیـــە بڵـــێ ئــــەم دانەســـــنە(*)
هـــی خودانـیـــەو دەستـــكردی منــــە ؟

★ ★ ★

بـەیـــــانیان هـــــەر كەڕۆژهـــــەڵات
هـــەر باڵنـــدەك كاتـــێ كــــە دەڕوات
بـــۆ ئێـــوارە كەدێتـــەوە تێـــر دەخـــوات
خـــودا هـــیچ یەكیـــان لـەبیـــر نـاكـــات

★ ★ ★

---

(*) سنە : زیندەوەرێكی بچووكە دەغڵ و دانەوێڵە دەخوات

کاتێ کە ئاگای وا لەئەوانە
دەفڕن بەپانی ئەم ئاسمانە
ئەوانەش وا لەقوڵی دەریانە
بێ شك خوا ئاگای لێ نەبڕانە

★ ★ ★

کەخوا بەووردی وا دەبینێ
هەرچی مێرووە یا ئەسپێ
وا وورد بەسەر ڕەقە بەردێ
هەڵدەگەڕێ لەنیوە شەوێ

★ ★ ★

ئێ چۆن ئاوابێ باکانە
تۆتاوانت لەلا ئاسانە
پێت وایە گەر کەس نەیدیت
لەلای خوای زانا پەنهانە ؟

★ ★ ★

هەرچی پەلەورو چی گیانەوەر
چی دڕندەیەو هەرچی زیندەوەر
ژیانیان چۆنە لەم سەرو ئەوسەر
هیچیان وون نابن لەپاشای سەروەر

★ ★ ★

هەنـــــدێك دووپێیـــــەو هەنـــــدێ چـــــەندپێ
هەنـــدێك پێـــی نیـــە لەســـەر ســك دەخـــشێ
چەشـــــنێك هێلكەكـــــەر، چەشـــــنێكیش دەزێ
ژیـــانی هیـــچ یەكیـــان لـــەوی تـــر ناچـــێ

★ ★ ★

هـــەر گیانلـــەبەرێك هەیـــە مـــێ یەكـــەی
بێـــچووی نـــاو ڕەحمـــی یـــا هێلـــكەكەی
چـــی تێـدایـــەو چـــەندە ماوەكـــەی
گـــەر مـــرد ڕۆژی چ شتـێكـــە لاشەكـــەی

★ ★ ★

گـــەر ژیـــا چـــەندە ژیـــن و مـــانەكەی
لەكوێیـــەو چـــەندە رزق و ڕۆزی یەكـــەی
لـــەكوێ دەرچـــووەو كوێیـــە نیـــشتنەكەی
هـــەرلای خوایـــە گـــشت زانـــستەكەی

★ ★ ★

هـــەر گەڵایـــەك و بـــەری هەردارێـــك
لەدەشـــت و شـــاخ و لەنـێـــو هەرشارێـــك
كـــاتێ دەكەوتـــە خـــوار بەهـــەر بارێـــك
خـــوا پێـــی عەلیمـــە لەهـــەر جارێـــك

★ ★ ★

هەر ئەم گەڵایە یا دەنکە تۆوێکە
کەوتۆتە خواری لەهەر سوچێکە
تەڕە یا ووشکە لەهەر دۆخێکە
چی بەسەر دادێ و چ سەرەنجامێکە ؟

★ ★ ★

گەر دەخورێ ڕزقی چ شتێکە
یا ئەگەر دەڕوێ بۆ چ سوودێکە ؟
ئەمانەو ووردتر هەر پەنهانێکە
لای خوا تۆمارەو لەپەڕاوێکە

★ ★ ★

ئەو دەریاو زەریایانەی قوڵن
ئەو ڕووبارانەی شیرن و ڕونن
کێ ڕێژەی سوێری بۆ داناوە
کێ ژیانی داوە بەهەرچی لەمناوە

★ ★ ★

گەر لەوەی ئێستا زیاتر سوێربێ
وەك دەریای مردوو هیچ تێیدا نازێ
گەر ڕێژەی سوێری کەم بێ شیرن بێ
هەرچی تێیدایە بۆگەن و پیسەبێ

★ ★ ★

بۆجارێ سەرنجی قوڵت نەداوە
کە ووتراوە زەوی سێ بەشی ئاوە
بێ ئاگاین لەوەی چی لەهەناوە
سێ بەقەد زەوی ژیان لەژێر ئاوە

★ ★ ★

هەرچی لەئاوە دەبینی دەژی
چین و چەندن چۆن دەگوزەری ؟
خۆراکیان چییەو چۆن خێزان دەگری ؟
هەر خوا پێی داون شێوازی بەرگری

★ ★ ★

خۆ ئێمە سەرچاوەی ئاوی شیرینمان
لەم ئاوە سوێرمیە کوا پاڵاڤگەمان
پاڵاڤگەکانمان هەوری چەترە
خوا دەیزانێ چەند دڵۆپ و لیترە

★ ★ ★

هەرخوا دەزانێ چەند دڵۆپە باران
بۆمان دێتە خوار لەهەوری ئاسمان
وەنەبێ نەبینێ چۆن ئێمەو جان(*)
ئاسمانمان پڕکردیە لەگوناهو تاوان

★ ★ ★

(*) جان: جنۆکە

هەوێنی هەوریش ڕۆژو بایە
خوا دەیهێنێ و دەیبا بەم لایە
ژیان بەبەر خاکی مردوودا دەکا
بەگیان و بێ گیان پێ تێر ئاودەکا

★ ★ ★

یا ئەو کەشتیەی چەشنی شاخێکە
بینایەی تێدایە نیمچە شارێکە
چۆن بەسەر پشتی دەریا وەستاوە
کەچی یەك دەرزی ڕاناگری ئەم ئاوە

★ ★ ★

کێ شتێ دەزانێ لەم پەردە پەنهانە
لەنێوان دەریای نێوەندو سوور دانە ؟
نە ئاو تیکەڵەو نە ماسی ناوی
هەر خوا دەزانێ حیکمەتی تەواوی

★ ★ ★

ئا ئەم هەوایە کاتێ وەستایە
هەناسەی ژینە بۆ ئەم دونیایە
گەر نەرم هەڵکا هەورو ئاوهێنە
یا صەبای دیندارو دوژمن شکێنە

★ ★ ★

گـــــەر تـــــوند هــــــەڵی کــــرد بـــــووبە ڕەشەبـــــا
ڕیحــــــی عەقیمــــــە گــــەل لــەنــــــاو دەبــــــا
سەربــــــازی خــــوایە هەستـــــی پــــێ دەکـــــرێ
کـــــاری خـــــۆی دەکـــــاو بەچـــــاو نابینــــــرێ

★ ★ ★

جـــا بەنـــــدە نورەکـــان مەلائیکــــەی پــــاك و جـــوان
ژمارەیـــــــــان، جۆریـــــــان، ذکـــــــرو چاڵاکـــــــیان
بــــــەس خـــــوا دەزانـــــــێ ژمــــــارەیان چەنـــــــدە
پارێزگـــــاری خواناســـــن هـــــاوڕێن بـــــۆ بەنـــــدە

★ ★ ★

هەروەهـــــــا جنـــــــۆکە، جـــــــۆرو تاقمیـــــــان
هــــــەوڵ و شێـــــوازیان بـــــۆ زەرڕی ئادەمــــــیان
لای خـــــوا زانـــــراوە بۆســـــەو پیلانیـــــان
چـــۆن ئێمــــەش دەکـــرێ ڕزگاربـــین لــــەداویان

★ ★ ★

تـــا ئێـــستا لەمـــرۆڤـــ چەنـــد کــــەس خولْقــــاوە
تــــا دوارۆژیــــش دێ چــــەندی تـــــر مـــــاوە ؟
ڕابـــــردوو و داهـــــاتوو پەنهـــــان و وون مـــــاوە
تەنهـــــا لای خـــــالق بــــــەووردی نوســــــراوە

★ ★ ★

ڕەحمـــــی ئـــــافرەت چـــی تیـــا دائـــەنرێ
دەبـــێ بەئینـــسان یـــان فـــرێ ئـــەدرێ
گـــەر خـــوا ویـــستی بـــێ مرۆڤـــێ دروســـت بـــێ
پێـــش ئـــەوەی ببـــێ چوارشـــت ئـەنـــوسرێ

★ ★ ★

ڕزقـــی چەنـــدەو کـــەی دەبـــێ بمـــرێ ؟
چ کارێـــك دەکـــاو هـــەم چـــی بـــەسەردێ
پاشـــان لـــەدواڕۆژ سەرەنجـــام چـــی دەبـــێ
دۆڕاوو بەدبـەختـــە یـــا ســـەرفراز دەبـــێ

★ ★ ★

گـــەورەیی بـــۆ خودایـــە بەتـــواناو شـــارەزایە
ڕۆژیمـــان کەنوســـرایە لەگـــەڵ عـــومر دایـنایـــە
کـەســـــێ کـــــەوا لـەئەشکەوتـــــایە
یـــا خـــــۆی لـــــەژێر زەوی دا نایـــــە

★ ★ ★

پـاکـــی و بـــەرزی بـــۆ ئـــەو خودایـــە
کـــە بـــە هەردووکیـــان بیـــسەروبینـایـە
شـــەو لای ئـــەو ذاتـــە وەك ڕۆژ وایـــە
پـەنهـــانیش هـــەروەك ئاشـکـــرا وایـــە

★ ★ ★

هەرچی لەدڵ حەشار درایە
خودا لەهەمووی بە ئاگایە
هەر چرپەو قسەو پەیڤینێک
لەهەر چرکە سات وقوژبنێک

* * *

یا هەر هەنگاوو هەرنیگایەک
ئێمە بیکەین بۆهەرلایەک
ئیلا خوا لێ ی بە ئاگایە
پاداشت و سزای بۆ دانایە

* * *

هاوکات هەر ئەو ڕێکخەری دانایە
بۆ هەرچی لەبوون و لەدونیایە
لەهەر ڕۆژێکا پەروەردگارە
زانایە بەهەرچی حاڵ و بارە

* * *

کێ فەقیرە هەرچی هەژارە
کێ نەخۆشەو دەردەدارە
کێ نەزۆکە بێ منداڵ و وەچە
هەرچی تەنیایە هەرچی بێ کەسە

* * *

کێ دووره وڵات و دووره شاره
هەرچی بەندی نێو چوار دیواره
کێ نابینایە بەم دونیایە
هەرچی بێ چاره کەرو لارمایە

★ ★ ★

کێ بێ لانەو بێ جێگەیە
ئەوەی لاوازەو دوژمنی هەیە
کێ بویتە بەندەی دینارو دۆلار
کێ دەڕوا بەدوای زاڵم و زۆردار

★ ★ ★

کێ خاوەن کێشەو گرفتاره
هەرچی غەمگین و خەفەتباره
هەر هەموو مەعلومی پەرومردگاره
زاڵ و بەتوانا لای خۆیتی چاره

★ ★ ★

تامەزرۆی تنۆکێکم لەتاڤگەی تێفکرینا
تینووی تەڕاییەکم لەترۆپك و تریفەی دینا

# خوشك

لـەنــــێو مــاڵـــی تـــۆدا کانیــاوێـــکی ســـۆز هـەیــــە
لـــــەدوای دایــــك و باوکــــــت ئـــــەو دڵـــسۆزی تـۆیــــە

حـەیــــفە لــــەلای زۆر کـەســــان غـــەریب و نامـۆیــــە
قــــەدرو نــرخـــــی نـازانـــــرێ لای کەســــێ کـەمــــۆیە

ئـــــەو کـانیــــاوە خـوشکتــــە خوشـــکی نێـــو ژیانـــتە
بـەڕەحــــــم و مـیـــــهرەبانە هاوهەســــت و هاوخوێنتـــــە

هــــەر لـەکـاتــــی منداڵـــی لەگـــەڵت هـــاوڕێ دەبــــێ
هـەتــــا بـچیـــە نێـــو تەمـــەن خزمــەتی بــۆت زۆر دەبــێ

ئـــــــــاوەدانی ماڵەکـــــــــە لـەتــــــــۆ دەبینـــــــــێتەوە
زیـنــدانــــــە بـــــۆی مــاڵەکــــە هـەتـــــا دەگـەڕێـــیتەوە

هــەر کێـشەکت تـووش ببـێ هاوغــەم و خـــەمخۆرە بـــۆت
دەڵــێ ی پارچـەکـــی لــەوی دەرونـــی پـــڕ ســـۆزە بـــۆت

خوشـــــك بۆخۆشـــی بـــرای خەریکــــە لەمـــاڵ جـــاڕدە
بــــراش بەرامبــــەر خـوشــــکی بەفـــرو ئاســـنی ســـاردە

چۆن ئــەو بۆچـاكتر لــەخۆی دەگــەڕێ بیكاتــە خێزانــت
دەتــۆش بــۆ پیـاوتر لــەخۆت بگــەڕێ و بیــكە زاوانــت

خزمــەتی هــەمووان دەكـا خۆشــی فـەرامــۆش دەكــا
دایكـت نــەمابێ دایكــە جێگــای ئــەو بــۆت پــڕ دەكــا

بــەتۆ كــەیفی بەخــۆ دێ پــشتی بەتــۆ ئەستــووره
دەتــۆش بــۆی بــە ئەمــەك بــە لێ ی مەبــە زەردە ســووره

خوشــكت دەرگــای ئابــڕوتە ئــابڕوی بەنــدە پێتــەوە
لــەدەرگای خەڵكــی مــەدە لەدەرگــات دەدرێتــەوە

مــافی بەســەر تــۆ زۆرە فــەت خــۆت لەگێلــی نــەدەی
ڕووی بەخەنــدەو بــزەی تــۆ كــەمترین ئەركــە دەیكــەی

تــا لەماڵــە لاوی یەكــەی خزمــەتی تــۆی پــێ دەكــا
دەتــۆش ســۆزی بــۆ بگــرە تــا قــسمەت بــەڕێ ی دەكــا

وەك میــوانێكی ئــازیز ســەیری ڕێــزو شكــۆی بكــا
ڕۆژانــێكە لەگــەڵ تــۆ پاشــان ماڵــت چــۆڵ دەكــا

ئینجــا زاری منداڵــی بەخاڵــەگیــان فــێر دەكــا
بــەردەوام چــاوەڕێ یــە براكــەی هامــوشۆی بكــا

بـــراش هـــەروەکو پێـــشوو ســـاردو ســـڕی تـــێ دەکـــا
بـــێ ئەمـــەك و بـــێ وەفـــا حـــسابی مـــردووی بـــۆ دەکـــا

کەچـی مـردوو خۆیـەتی بـێ ڕەحـم و هـەم بـێ ویـژدان
گـەر چـاکەی خوشـکی نـەدا چـاکە بـچـتـە گـۆڕسـتـان

بـــەخوا کەســـێ نـــەزانێ نرخـــی دایـــك و خوشکـــەکان
هـــەق وایـــە لـــەماڵ دەرکـــرێ ژیـــان بباتـــە دەشتـــەکـــان

★ ★ ★

تۆ خانەدانی خولیای خزمەت و خـۆ بـەخـشـی
خەجاڵەت بێ ئەو برایەی خەفـەتت پـێ دەنۆشـی

# بەهای بێ دەنگی

یەکێ لەو شوێنەی، خوا ڕقی لێ یەتی
بازاڕەکانە چوون، دووشت جێیەتی
هاوارو قیراندن، سیمای دەرێیتی
فرت و فێڵ و درۆ، دیوی ژووریەتی

* * *

کەچی مزگەوتەکان، بێ دەنگ و ئارامن
شوێنی کڕنۆش و ، زیکرو سەلامن
هاوارو دەنگ بەرزی، تێیاندا حەرامن
خۆشەویستن لای خوا، فێرگەی مەردانن

* * *

لە ئاکاری بەرزی، پێشەواو ڕابەرمان
لەتەوڕات هاتووە، لە ئینجیل لەقوڕئان
لەسەر خۆو هێمنە، دەبوورێ لە هەڵان
دەڕوا لەبازاڕ، هاوار ناکا بەخەڵکان

* * *

دایکە خەدیجە، بەڕاستی دایکمانی
دەیزانی پێغەمبەر، لە قڕو قیژانی
قوڕمیش بەسەریا، ماندووە لەژیانی
کەشێکی ئارامی، بۆ پێغەمبەر هانی

* * *

خـــــوداش بـــــەجبریل، لەبـــــۆی نــــارد ســــەلام
مــژدەشـــــــی پـێـــــدا، بـەمـاڵێـــــکی ئــــارام
لــــــەقامیش دروســــــتکراو، لەبەهەشـــــتی کــــیرام
لــــە (نــــبيَ) و ئـــالو بـــــەیت، صــــەلات و ســــەلام

★ ★ ★

بەگـــــشتی لای خـــــوا، دوو خەســــڵەت پەســــــندە
نــــــەرم و نیــــانی و، هێـمــــــــنی شـــــــەرمندە
گـــــــەر لـەتـۆدانــــــین، بۆیــــان هـەوڵــــــدە
پێــــیان جـــوان دەبــــی، شــــابی یـــا بەنـــدە

★ ★ ★

مەگــــــەر نەتبیـــــستوە، لـەقـــــورئانی کـەریـــــم
ئامۆژگـــــاری دەکـــــا، لوقـمانـــــــی حەکیـــــم
دەنگمــــان نـــــزم کـــــەین، لەکـاتــــی ووتـــــو وێـــــژ
ناخـۆشـتـریـــــن دەنگـــــە، زەڕینــــی گـــــوێ درێـــــژ

★ ★ ★

بــــــەلکو ڕەوشتــــــی، بـــــێ بــــــڕواو بــــــەدکارە
دەم شـــــــــــڕو زۆر ڕەوە، دەم بـەهــــــــــاوارە
تــــا دەڵـــێن بەخــــەلکی، زاڵبونتــــان لـــــەم کــــارە
گـــــوێ نــــــەگرن لــــــەقورئان، بیـکــــەن هـــــاوارە

★ ★ ★

تەنانەت لەدوا ڕۆژ، کەس قسە ناکا
مەگەر بە مۆڵەتێ، هەقێك بەیان کا
چرپە چرپ نەبێ، هیچی تر نابیستی
ڕۆژێکی سەختە، لەگوناهەت پەستی

* * *

ئەوە بەهەشتەو، پڕ لەشادیە
باغێکی خۆشە، پڕ لەبێ دەنگی یە
ئارامی تێدایە، لەقورئان هاتیە
لەسورەی نەبەء، مەریەم، غاشیە

* * *

تێیدا نابیستی، قسەی نابەجێ
یا هات و هاوارو، بێزارکەری گوێ
مەگەر هەواڵ و سەلام و کەلامێ
لەسەر بەهرەی خوا، بەڵێنی هاتەجێ

* * *

گەر بۆ یادی خوا، دەنگ دەبێ نزم بی
چۆن دەبێ بۆ دونیا، دەنگت هەڵبڕی
گەر زمان بەڵای، سەرو لاشەتە
(مَن صَمَتَ نَجا) ڕێگا چارەتە

* * *

**وورياببە ئيبليس، بۆت لەبۆسەيە**

**تێكچوونی زۆر خێزان، بەهۆی هۆسەيە**

**لەمێژە ووتراوە، گەر قسە زيوبێ**

**بێ دەنگی و ئارامی، زێڕی سەدەيە**

★ ★ ★

**لەبۆلە بۆلی بازاڕو بەردە باران بێ بەش بە**

**لەبێ دەنگی بەيانی و بيرمەندی بەند بەئومێد بە**

# خامەی پاك

مــــــن پینـــــــووسم مـــــــنم خامـــــــه
داندەنـــــــــیّم تـەنهــــــــا (الله) خــــــــودامه
مـــــن یەکــــــەم دروستــــــکراوی خــــودامه
مـنــــم لەلایــــەن خـــوا ڕێــــز لیّ گیـرامــــه

***

خــــــودای گـــــەوره فـەرمـانـــــی پـێـــــکردم
هەرچـــــــی دەبـــــیّ و ڕوودەدا بـیـنووســـــــم
بۆمــــــن جێگــــــای پرشانـــــــازی یـــــه
خـــودا زانــــستی خـــۆی بـــــەمن نووســــیه

***

هـــــەر لـەئێـــــستا تــــــا دواڕۆژ دێتـــــــەوه
هەرکـەســــــیّ خامــــــه ڕاســـــت بکاتـــــــەوه
تـاکـــــو لـــــەمەڕ خـــــوا شـــــت بنوسێتـــــەوه
شـــــانازی کۆنـــــم بـــــــۆ دەگەڕێـــــتەوه

***

هیـــــمای فـەخـــــرو زانـــــسته خامــــــــه
بـــیّ ئـــەو ئامانـــجت، بـــیّ ســـوودو ناکامـــه
گــــەرکرا ئـامـــــراز بـــــۆ کـوفــــر حەڕامـــــه
کـــەدژی خـــوا جـــولا مـــن لـــیّ ی بەڕامــــه

***

هـــــەروەك ئێـــــستا ســـــەردەمی فیـتنەیـــــە
ســـــەردەمی فێـــــڵ و فریـــــودانی بەندەیـــــە
زوڵـــــم و زۆرداری لەوپـــــەڕی لوتکەیـــــە
ســـــەرەتای زۆر ســـــتەم لـــــەنوکی خامەیـــــە

***

ئینجـــا پێهەڵـــدان، بـــە ووتـــەو هۆنـــراوە
بـــەشان و باڵـــی، هەرچـــی ناپیـــاوە
لەکتێـــب و ڕۆژنـــامە، چـــاپ و نوســـراوە
بەســـەر خەڵکیـــدا، بـــەلاش بەخـــشراوە

***

بوختـانـــی پـــێ دەکـــرێ، خامـــەی بـــێ نـــەوا
کەپـــێی دەنووســـرێ، هەرچـــی نـــاڕەوا
بـــە پاکـــی گـــورگ، لەخوێنـــی یوســـف
بـــێ بـــەری یـــە خامـــە، لـــەوەی پێـــی نـــووسرا

***

چـــەند خوێنـــدکار هـــەبوو، بـــەنمرەی ساختـــە
بـــووبە دکـــتۆر، بووبـــە مامۆستـــا
ئەنجـــام لەجیاتـــی عیـــلاج لەخەســـتە
بـــۆ خـــەڵکی بوونـــە، بـــەڵاو بەجەڵتـــە

***

چـــەند کـــافرۆش هەبـــوو، بـەنـوکـــە ئـیـمـــزا
کـــرا بـەکـوێـخـــاو بـــــەرپرس و مـــیرزا
چـــەندین هـــەق هەبـــوو، بەنـاهـــەق خـــورا
کەســـانی هـــیچ نـــەدی بەشـــایەت نووســـرا

***

چەنـدجـــاره بـــــەپاره، خـــــامه جـــولاوه
مـــافی کـــــەسانی پـــێ زەوت کـــــراوه
بەدەستـــــی ســـــەرێك و واژوی شـــــاراوه
گەنجیـــــنەو خـاکـــی پـــێ هـــەراج کـــراوه

***

هەربـۆیـــــە ئـێــــستا خامـــــە دامـــــاوه
لـــەم هـــەموو تاوانـــەی پێـــی ئـەنجـــام دراوه
خـوایـــــە بـــــۆلای تـــۆ سـکـــاڵام هـێـنـــاوه
لەهـــــەر پێنـــــووس و تێنـــووسێ لایـــداوه

***

گـەر خامـە خـاڵێکی نەخـستـە خـزمـەت
خـــاڵی وخنکـــاوه لەخـــەوی خێـــوەت

# زستان

زستان بەهاری بەندەی دیندارە
ڕۆژەکەی کورتە بۆ ڕۆژوو دەسبارە
شەوانی درێژیش دڵ تێیدا بێدارە
لاشە وەستاوە و قورئانیش بەزارە

***

زستان پاییزی گوناه ڕێزانە
هەژاری سك برسی ئاتاجی نانە
ئاتاجی پۆشاك و ماڵ و دەرمانە
بۆ نەوەی دواڕۆژ(*) فرسەتی ژیانە(**)

***

زستان هاوینی جووتیارو کرێکارە
دروێنەی ڕەنجی لەم وەرزەدا دیارە
بارانی ئەم وەرزە بۆ گەرمی گیرفانە
پێیوایە بەدڵۆپێك دەنکێك لە ڕوانە

***

(*) نەوەی دواڕۆژ : ئەوکەسانەی کار بۆ بردنەوەی دواڕۆژیان دەکەن .

(**) فرسەتی ژیانە : فرسەتە بۆ بەدەست هێنانی ژیانی نەبڕاوەی بەهەشت

بـــــەفری جـــــوانی شـــــاخ وا بۆتـــــە کـــــڵاوی
خەزێنـــــەی زســـــتانە کانـگـــــای کانـیـــــاوی
پـــــاکی بۆتـــــۆ خوایـــــە دروســـــتکەری هەتـــــاوی
بـــــەفر دەخەیتـــــە خـــــاکێ گڕکانـــــە هەنـــــاوی

***

زســـــتـــــان زەنگـــــی زانـــــستە بـــــۆ زیـــــندووبوونەوە
زەردەخەنـــــەی زەحمەتکێـــــشە بـــــۆ بـــــەزیاد دووریـــــنـــــەوە

# شەو

شـــەو ووشـــەی نـهـێنـــی بـەگوێ ی یـارانی ئەچرپێـــنێ
کـەمن هـاتم ئێـوە مـەڕۆن خـۆ هـەموو شتـێك نیـە خـەو

شـــەو لەمـنـــدا (رَبُ العِـزة) بــۆ ئاسـمـانـــم دائەبـــەزێ
عـەیب و نەنگە لـەم هەلە گرنگە لـەبێ ئاگایـان بـن شـــەو

کەشـــەو (رحـمـــن) ڕەحەماتـــی خـــۆی دائەبـارێـــنێ
چـۆن ئاتــاجی ئـەو، بۆئـــەو داوایـــێ بـەرز نـاکـا شـــەو

لـــەڕۆژدا کـەبـــەندە بەنـدە نـاتوانێ بەندیەکـەی بـشکێنێ
بـــۆ بۆڕزگاربـــوونی بۆڕزگارکــاری هـانـاناهـێنـــێ شـــەو

کـەڕۆژ ڕێـبـوارانـــی ڕێ مـانـدوو و شـەکەت ئـەتـاسێنـــێ
بۆ توێـشووی نـوێ بـدەن لـەدەرگای بارەگای تاقانـــەدا شـــەو

کەشـەو ڕەشـمـاڵـی ئـاسودەیی بەئاسـمـانـدا ڕائـەکێـشـێ
مۆڵـەتی عـومرە بـۆ کـاری سبـەینـێ یـــە نـیـــازی شـــەو

کـەشـــەو تـیـــشکی خـۆر لـەنێو خـۆیـدا ئـەخنـکـێنـــێ
فرسەتی هێزی چاوە بۆنیگاو بینـــای ڕۆژی نـــوێ یە شـــەو

کەبـــێ دەنـگـــی بـاڵـــی ئـارامـــی بـۆمـــان دائـەنوێنـــێ
ســـەدای ســـەحەری چاوبەگریانـــی تەوبەکـارانـــە شـــەو

کەپۆشـــاکی ڕەشـــی بۆخـۆشـیمـــان دائەپـــۆشێ
بـۆ ڕونـاکی شەوقـــی لیـقـــای گـــشت بـێـــدارانه شـەو

کـەتـــاریکی بـەئاســـۆی پـانـــا لـەئـــەوەلا دەرئـــەکەوێ
بۆتـــاوێ کـــەوتن و گـەڕانـــەوەی هـێـــزی هەنـــاوه شـــەو

کەشـــەو چـــرای گـەشـــی ئەستێـــرەکان دائـەگیرسـێنـــێ
ئیعلامـــه بـەهـــەڵبونی ڕونـــاکی ڕووی ڕێبوارانـــه شـــەو

کـه مـانگ ڕوناکـه بەشـەو بەتیـشکی خـۆر خـۆی ئەدرەوشێنـێ
نـوری نـوره بەخـــشراوه بـەشـەیـدایـانـــی ئـــەم نـوره شـــەو

کـه گـۆڕی تـەنگ و تاریـك تـەنگ بەبـەنـده هەڵئـەچنـێ
چـرای منـــەوەری گـــۆڕو سـەفـــەری درێـــژه نـــوێژی شـەو

کـەشـــەو دەنـــگ و جـــڕو جـەنجاڵـــی ڕۆژ ئـەتورێـــنێ
بـۆ ڕۆح[*] بـەبـەرداکـردنـــی لاشـــەی مـــردووەکانـــه شـەو

کەلـــەنێو مردووەکانـــا بـــەس زینـدووەکـــان هـەڵئەبـژێـــرێ
بۆســـەهلی حەشـــره خەبەریانـــه لەحەشـــری سـبـەیـــنێ شـــەو

شـــەو شـادەمـــاره بـۆشـــادی شـــاکار
شـانـــۆی شـکـانـــه بـۆشـــاهی شکۆدار

(*)ڕۆح : قورئان خوێندنەکه وەکو ڕۆح ژیان بەبەر لاشه مردووەکان ئەکا: (وكذلك أوحينا إليك روحا من امرنا...).

# هەژاری و هەژان

خــەڵکێکی ســادە و بــەرێزو نــەجیب زاد

نــەبوون و ئاتــاجن بــەرۆن و بـەئــارد

دەور و دەریــــان دایــــم چـۆڵــــە

دانیــــشتنیان هــــەر لەســــەر خۆڵــــە

کەسەیریان ئەکەی بزەك ئەکەن، لەگەڵ هەناسەیەکی سارد .

★ ★ ★

کەســانێکن بــەوەی لێ ی بــێ بــەش بــووینــە

بـوون بـە نزیکـی خـوداو هـەم بـەرێز بووینـە

ســك و هـــەناویان دایــم برســـی یـــە

لــــەهام و شــــۆیاندا کەسیـــان نیـــە

ئێمــەش بــەوزۆرەی هەمانــە لــەلای خــوا نــابووت بووینــە .

★ ★ ★

خانەوادەی بێ دەنـگ و بـێ هۆسەو خامـۆشــن

برســیانەو هیــچیان نــەماوە نــەیفرۆشــن

گــەر برســێتی ڕێیــەکی لــەهاری یــە

هــاری ئــــەمرۆ لەدەوڵەمـەنــدی یـــە

کاتێ بـەلای ماڵە هـەژارێ تێپـەڕی وادەزانـی کـەلاوەی بۆشـن .

★ ★ ★

پـیـاوانـیـــان بـەویـــژدان و دەروون پاکـــن

نـەداری پـارەو زەنگینـی دیـن و دیـدی ڕونـاکن

قـەنـاعـەتـــــــیان بەکـــــــەم زۆرە

زۆریـــــش لایـــان خـــەونی ســـۆرە

شـەو لەخـەوی ئارامدانـە، لـەترس و دڵـەڕاوکێ بـێ بـاکن .

★ ★ ★

ئـافـرەتـانـیـان ڕاهـاتوون لـەئارامی و خـۆگری

ئەفرەتیان داوە بـەڕووی هەڵچوون و یەخـەدڕی

هـــــــەروەك دایکـــــانی ژیـــــنن

ڕەزامـــــــــەندو دوور بیــــــــنن

ئەمە کدارن بۆ پیاوانیان، ئەوانیان گەرەکە نەك گیرفان پڕی .

★ ★ ★

منداڵانیـــان بـێ نـازو کـــزۆڵ و دامـــاون

چاو بەفرمێسك لـەم ژینـە سـەختە حەپەساون

داوایـــــــــان زۆرە لەدایـکـانیـــــــان

هـــــەر نیــــەو نیمانەیـــــە وەڵامیـــان

لـەزۆر دەســت خـستنە گیرفـانی بـەتاڵیان، گیرفـان دڕاون .

★ ★ ★

بەلەرزیـــن پێـــشوازی لەزســـتان دەکـــەن
جلـە دڕاوەکانیـشیان بـۆ هـاوین دەسـت دەدەن
جاگـەرمـــــــــە یاســــــــەرما
پانکـــــەو ســـــۆبەش نیـــــەو غـــــەما
شـەوی ڕەش و ڕۆژی سـپی بەسـکی برسـی وا بـەڕێ دەکـەن .

★ ★ ★

بـــەڵام لـــەدوا ڕۆژدا حـــسابیـان ئاســـانە
لـــەدونیا چـــەژتیانە چـــی نـــەبوونی و ژانـــە
دادوەری خـــــــــــــــــودایە
هەرهــــــــــەمووی ڕەوایـــــــــــە
هەژاران (٥٠٠) ساڵ پێش زەنگینەکان دەچنە ئەم بەهەشتانە .

★ ★ ★

بەهانـــاو هـــاواری هـــەژاریّ هـــەرۆ
بـــا هەڵـــەت هـــەڵوەریّ بـــەهیوای هێـــرۆ

# دەوڵەمەندی و دەعوەتی مردن

هـــــۆ ئـەوكەســــــەی خـــــــودا پـــــێ ی داوی
كـــــــۆشك و پـــــــارمیه یــــــا جوانـــــــی و لاوی
لات ئـەمـانـەتـــــــه تـــــــۆ لـــــــێ سـەنـــــــراوی
یـــــا خـــــۆت لـەنـێـــــو گـــــۆڕ بەجـــــێ هـێـڵـــــراوی

***

هەرچـــــی تـــــۆ هەتـــــه هەرهـــــەمووی نـیـعـمـــــەته
دەســـــت مـەبـــــه بـــــۆ شـــــتێ ئـــــەنجامی نیقـمـەتـــــه
تـــــۆ هـــــی خـــــۆت بەســـــەو شـــــەرت قەنـاعـەتـــــه
بادونیـــــا هـــــی تـــــۆبێ كـــــەجێت هێـــــشت خـەفـــــەته

***

گـــــەر شیـــــخ و ســـــەرۆكی و یـــــاخود لێپـرســـــراوی
گـــــــەر خـــــــاوەن چەكـــــــداری دەمـــــــامك دراوی
گـــــــەر ڕۆژت تەواوبـــــــوو بـــۆچركـــــــه تـــــــاوێ
نـــاتـــوانـــــــن دواتـــــــخەن تـــــــۆ تـەنیـــــــا مـــــــاوی

***

ڕۆژانـــــــــێ كـــــــــەدەورو دیوانـــــــــت دەوڵـــــــــەته
لەكۆشـــــكی ســـــەروەری و بـــرپـیـــــارت بـەدەسـتـــــه
بزانـــــەو بەهەســـــت بـــــه هـــــەرچی عیـــــززەته
بۆخـــــوای بەدەســـــتەو سـەرپـێـــــچی ذیـلـلـەتـــــه

***

گەر تازە گەنجی یا فەریکە لاوی
هەر لەبەر سێبەرو دوور لە هەتاوی
خاوەن قژی لوول، دوو گەورە چاوی
هەر دەچیە گۆڕو دەرزی لەناوی

***

کێ داناو عالیمە پڕ مەعریفەتە
پرۆفیسۆرو عەبقەری زانای بلیمەتە
گەر لەخۆ بایی بی ئەوپەڕی غەفلەتە
هەرچی بی ئاوێکی ژێر زەوی جێگەتە

***

گەرخاوەن هێزو لاشەی پتەوی
چی شێرو پڵینگە دەیدەی بەزەوی
مل کەچ بە بۆ خوایێ عەزیزە هەم قەوی
دەمارێکت بپسێنێ دەمری و دەکەوی

***

گەر سەیارەی جوان و مۆدێرن لەبنتە
پێ بچیە هەرشوێنێ تۆ لەوێ ی و لەگنتە
ڕەنگە ڕۆژێ دێ تۆ کۆتای تەمەنتە
سەیارەت جەنازەو هۆکاری مردنتە

***

داستانی دارایی دروشمی دڵتەنگی یە
دڵخۆشیکی دڵنیایی دونیای دە ڕەنگی یە

# پەیکەرەکان ساز دەکرێنەوە

سەیرە لەسەردەمێکداین سەرمان تێیدا شێواوە
هیچ شتێ وەکو جاران لەجێ ی خۆیدا نەماوە
ئاخر چ زوو ئەم خەڵکە ئەوها واڵ ی گۆڕاوە
چۆن وا لەکاری چاکە وا دوورو داماڵراوە ؟

★ ★ ★

هەر نەفامی جارانە بەجل و بەرگێکی تازە
بەشێوازێکی نوێ یەو هەم بەناوێکی تازە
بەڵکو خراپتریش لەمە هەرچی شوێن و ئامرازە
بۆ گومڕاکردنی خەڵك بەهەرزان وا لەسازە

★ ★ ★

هەر بەلاڕێ چوونەك و کارەسات و ڕووداوە
بەرێکەوت و لەخۆڕا نەهاتۆتە ئاراوە
بەڵکو لەوکاتەی خەوتین ئێمە وا لەگوێ ی گاوە
دوژمن شەوی بێدارەو بەرنامەی بۆ داناوە

★ ★ ★

بەنەخشە ڕێگایەك و بیرو بۆڕی(*) ڕۆژئاوا
بە ئەبو ڕیغاڵ(**) سەردەم لەگەڵ بەڵێ سەرچاوا
نەوت و کانزامان دزراو بەئاشکرا وا ئاودیوکرا
مەتا(***) و مەساج و مەشروب لەجیاتی بۆمان هێنرا

★ ★ ★

---

(*) بیرو بۆڕی : ئەو بۆڕیانەی کە نەوتی ئەم گەلەی پێدا دەچێتە نێو بیری بێگانە.

(**) ابو ریغال : ئەوکەسەبوو کە ببوە چاوساغی لەشکری ئەبرەهە بۆ تێکدانی کەعبەی پیرۆز

(***) متی : یەکێکە لە ئینجیلەکانی نەصرانیەکان

ئـــەم جـارەش وەكــو پـێـــشـوو بـت گــەلێك ســازكرانەوە
بـــەو ئومـێـــدەی ئـــەم گەلـــەش گـێــژو گـومڕا كەنـــەوە
هەرچــــی لات و هوبـــــەلە دیـــــسان وا هێنـــــرانەوە
لـــــەبەرگ و بەنیــٚوی تـــر بەخــەڵكـــی فرۆشرانـــەوە

★ ★ ★

ســەیرە كـــەخەڵكی ئێمـــەش تـەنهــا كڕیاریــان نــی یــە
بــەڵكو شـوێن كەوتــەی ووردی جولەكــەو نەصـرانی یــە (*)
خـــاوەنی بــــڕوای قـــوڵ و بـــاوەڕی پتـــەو نـــی یـــە
لەســـەر گــشت خــەت و پــەتێ بەتونـدی هەڵپـــەڕی یــە

★ ★ ★

پـەنـــا دەگـــرم بەخـــودا لـــەوەی لـەو كـەسانـــە بـــم
دونیایەكــم پــێ بــدەن سوژدەیـــەك بــۆ بــت نــەبــەم
كەچــــی لـەنــاو دڵـمـــدا خـاوەنـــی وێـنـەیــەك بـــم
دڵـم بـۆی لەســوژدەبێ و بەهـۆشیـــش لــێ ی جیـانـەبـــم

★ ★ ★

بتــــەكان گـەلـــێ زۆرن شــێوەی جیاوازیــــان هــــەیە
بەڕواڵـــەت موسڵمـــان و بـــــەندەی دڵـــسۆزیـان هـــەیە
هەنـدێــــك پەیـكـــەری كەســـێ لـــەدڵیا ڕەگـــی هـەیـــە
گـەنجیش هەیـە ئافـرەتـــێ وێـنـــەی بـــۆی گــڕی هـەیــە

★ ★ ★

(*) هەروەكو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی : (لتتبعنّ سنن من كان قبلكم ........)

هەندێکیش پول و پارە لەگەڵلەی سەری دایە
هەتا لەسەرە مەرگیش ناوی پارەی هێنایە
چەشنێکیش ژین و بوونی لەسەر کورسی یەکەی دایە
گەر پێچکەیەکی بشکێ خەڵکی بۆ بەکوشت دایە

★ ★ ★

بۆیە پێغەمبەری خوا دوای ئەوەی دڵەکانی
پاککردەوە بەئیزنی خوا لەشیرك و شێوەکانی
بەرەو مەککە گەڕاوە و بەدەستی هاوەڵەکانی
ماڵی خوای پاککردەوە تێکی شکاند بتەکانی

★ ★ ★

سەیرە هەندێك تا دوێنێ ئەهلی تەوحیدی بوون
ئەمڕۆ بەبت پەرستان تێکەڵ و ئاوێتەبوون
بەداوو فاقی سیاسەت پەلکێشی بتخانە بوون
بەخۆ خۆیی و جودایی سووك و پەرتەوازە بوون

★ ★ ★

کەنێوە لاتانداوەو وازتان لەهەق هێناوە
خەڵکیش زیاتر شێواوەو ڕووی بۆ بت سوڕێنراوە
لەناخت ئاوڕ دەوەو لەبتەکان پاکی کەوە
بەتەنها ناوی الله ڕوناك و ڕۆشنی کەوە

★ ★ ★

پەیکەری پادشا پوشکەو پشیلە پاشکۆیەتی
هەرپاچی پۆڵایینە پاککەرو پانکەرەوەیەتی

# پڕۆژەت چی یە لەژیان ؟

هـەرچـــی بوونـــەوەرە، لـــەجوڵەو مەلـــە دایـــە
ژیانیـــش بـــەردەوام دەڕوا، وەستانـــت بـــێ مانـــایە
چـی خـــودا بـەدی هێنـایــە، بەرنامــەی بـۆ دانـایــە
گــەرتۆ پڕۆژەکــت نـەبــێ، کاتـــت بەفیـــڕۆ دایــە

★ ★ ★

ئێـــستاکە گــەنج و لاوی، کاســەی عـــومرت نـیوەیــە
ژیانـــت قـۆنـــاغ و هـەلـــە، قۆزتنـــەوەی بردنـــەوەیە
لـەقـۆنـــاغی منـــداڵیت، بیـــرو توانـــات نـوکتـەیــە
لـەپـیـــری دا بـــێ توانـــای، بیریـــشت پـەککـەوتـەیــە

★ ★ ★

ئـێـستـا پرسـیار ئـەوەیــە، ئایـا تـۆ پـڕۆژەت هەیـە ؟
بۆخـۆت و دەوروبـــەرت، کـەڵــك و خێـــرت پێوەیـــە؟
بـــۆخاك و شـاری تـێــیدای، نیـــازی وەفاییــت هەیـــە؟
گـەر وانـەبووی بـەردێك بـووی، ژیانـت هـیچ مانـای هەیـە؟

★ ★ ★

دەســـت بەســـەری منداڵـــی، بـــێ بـــاوك دابـهێنـــە
دڵیـــان خۆشــکە بەدیـــاری، بـەزانـــست بیـــان دوێـــنە
بـــۆ بـــە پـــاکی مـــانەوەی، دەی بـێوەژنـێـــك بـهـــێنە
پاداشـــتی موجاهیـــدێك، بـــەم کـــارەت بـــەدەست بـێنە

★ ★ ★

یـا پرۆسـەی هاوسەرگیـری، بـۆ گەنـجـان پێـك بهێنـــە
مــاڵ و حـاڵیـــان بـۆدانـــێ، شـــادی بـــۆ ژینیـــان بێنـــە
یـــا بۆمـاڵــی هـــەژاران، خـواردنـــی خۆشیـــان بـــۆ بێنـــە
خۆشـت لــەوان بـزانـــە، جـل و بـەرگیـــان بـــۆ بێنـــە

★ ★ ★

بینــــای نەخۆشخانەیـــــەك، بۆهـــــەژاران بـــــەڵێن بێـــت
لەتـــۆ دەرمانخانەیـــەك، بــــۆ نــــەداران خــــەڵات بێـــت
یـــا چـارەی نەخۆشـێك کــە، پـارەی لەئەسـتۆی تـۆ بێـت
لــەش سـاغی بــۆ بێنــەوە، تــا دوارۆژ بـەکـەڵکـــت بێـــت

★ ★ ★

گــەر حەزیـــشت لەماڵــە، لەنێـــو بەهەشتـــی بـەریـــن
مزگـەوتان دروسـت بکــە، بــۆ خــودای هــەقــی مُبیـــن
یـــا بـیری ئــاو لێبـدە، بــۆ خەڵکانـــی گـونـــد نـــشیـن
یــــا ڕەزو بــــاغ بـــچێنـــە، بــــۆ ڕێبوارانـــــی زەمیـــــن

★ ★ ★

یـــا دیـــل و بەنـــدی زینـــدان، بەپـــارە ئــازاد بـکـــە
یــاخود قــەرزی قــەرزارێك، مەهێڵــەو سـەری سـووك کــە
یـــا پـــــڕۆژەی موســـڵمانێ، لەپێـــشی بەربەستێکـــە
ئـــەو بەربەســـتەی بـــۆلادەو، کـارەکـــەی بـــۆ تەواوکـــە

★ ★ ★

زانستێك بڵاوكەوە، داهێنانی بەسوودبێ
پەرتووكێك بنووسەوە، بۆ گەنج چرای ڕێگابێ
پاداشتێك دەدوریەوە، مەگەر خوا پێی زانابێ
تا ئەوچاكەو زانستە، مابێ خێر بۆت دەنوسرێ

★ ★ ★

مەلێ زۆربەی پڕۆژەكان، تەنها بەپارە دەكرێ
كاری چاك و جوامێری، سنوری بۆ هەڵناچنرێ
ئامۆژگاریت بۆخەلكی، پارەو پوڵی تێناچێ
زۆربەی ڕق و كینەكان، بەیەك سەلام لادەچێ

★ ★ ★

ووتەو ووشەی شیرینیش، كەس لێیان بێ نیاز نیە
پێوە خۆشەویست دەبی، هیچ تێچووی تێدانیە
مەگەر زانیوتە نیوەی، چارسەری نەخۆشە
لەسەر زارو دوولێوی، پزیشكی قسە خۆشە

★ ★ ★

پرۆژە: پەیام و پەیژەی پێ گەیاندنە
پاڵدانەوە: پاشكۆیی و پێناسەی پەككەوتنە

# تێکدەری خۆشیەکان

چـوار پـیـتـن کە یەکدەگرن دەبنـە ڕاسـتـەقینـەیـەکـی تـاڵ
یـــەك ووشــەیـــە کـەپێت ووتـرا دەبیـە نامـــۆ لەنێـــو مـــاڵ
ژیـانـت چـەنـدە؟ دیـــاری کـراوە چـرکەی ڕۆژو مـانـگ و سـاڵ
تـەنـهـا یـەك کـەس لـیٚ بەدەر نیـە لـەدونیای پـووچ و بـەتـــاڵ

* * *

بـڕیـارێـکـی خـودای هــەقە تـەنها بــەسەر خــۆیـدا نــایــەت
دەرچـووەو بـەهیـــچ شـێوەبارێك گـــۆڕانی بەسـەردانـایــەت
دابــەزیــوە بـۆســـەر زەوی نووسـراوە لەچـەنــدیـن ئایــەت
نـاوی مــن و تــۆشــی تێدا کـەسیـــش بـەفـریـامــان نـایـەت

* * *

کـیٚ هەیـە پـێـی بـووتــریٚ تـــۆ دەکـوژریٚ ی لەهــەر سـاتـــیٚ
کەچـی بـیٚ خـەم لیٚ ی بخـەویٚ و بـیٚ چـەکیش گـویٚ نـــەداتیٚ
کـیٚ بڕیـارە بێتـــە بـــوون لـــەو ڕۆژەی لـەڕەحـمـــا دەبـــیٚ
بـڕیـــاری کـــاتی مـــردن و نـەمـانـــەوەی بـــۆ دەردەچـــیٚ

* * *

بـۆ بـۆ بڕیـارو هەڕەشــەی مــرۆڤـــیٚ ســـەد حـسـاب دەکـەی
خـــۆت لـەنـێـو پـاســەوان و کـۆشـکـی بـــەرز حــەشاردەدەی
کەچی بـۆ بڕیارەکـەی خـودا دار لـەســەر بـــەردی دانـانـــیٚ ی
ڕزگـاربوونـیــشـت مەحاڵـە باخــۆت لـەنـێــو پــۆڵا دانـــیٚ ی

* * *

ژیرو هۆشمەند ئەوکەسەیە لەیادی خۆی نەباتەوە
ژیانی دونیا پڕ بۆسەیە با خەوە کوتکە نەتباتەوە
ژانی یەك شەوی نێو گۆڕت خۆشی دونیا بیر ئەباتەوە
ژیانی پڕ تاوانی زۆرت گۆڕت تەنگ و تار ئەکاتەوە

★ ★ ★

ئەو دونیایەی پڕخۆشی یە مردنە نابڕووی بردیە
ئەو فیرعەونەی سەر کورسی یە مەرگە وا پشتی شکاندیە
کەسێ دەمرێ ملك(*) دەڵێن:چی لەپێش خۆی بەرێ کردیە
کەس و کاریش لەو خەمەدانە چی لەدوای خۆی جێ هێشتیە

★ ★ ★

هەروەك هاتیە ئەم دونیایە نەتزانیوە و تێیدا وێڵی
دڵت بەچی خۆش کردیە کە نازانی کەی جێ ی دێڵی
با نازوفیزت قەد نەبێ کاتێ دەڕۆی لەسەر خۆڵی
با پادشابی کەڕۆیشتی خاوەن گۆڕێك و دوو کێڵی

★ ★ ★

تا مۆڵەتی مانت لەمەیدان ماوە
مەینەتی مەستی مۆردە(**) دواوە

---

(*) ملك : مەلائیکە بەڕێزەکان پرسیاری کردەوەکانی ئەکەن .

(**) مۆردە : کۆتایی پێ بێنەو بیخە دواوە

# دڵ

لــە ووڵــاتی لاشـــەی مـرۆڤـــدا دڵ پـایـتـــەخت و پـاشـا کـەیـتـــی
کـــە داگیـرکـــراو شـــا ئـەسـیرکـراخـەڵـکـــی لـەشـــی بـەدواومیـــتی
لـەمـەیـدانـــی جەنـــگ و شـــەڕدا دڵ پـێـــشەوا و سـەرکردمیـتـــی
کـــە ئـــەو کـــوژراو ســـەری پـەلـدرا نوشـــستـی بـــۆ سوپاکـەیـتی

★ ★ ★

قاســـــەی پـــــڕ لـەئاڵتـــــوون و زیـــــوی زۆری تیـایـــــە دڵ
تـەمـاعـگـــــەی هـەرچـــی جـــــەردەودزو دێـــوی دونـیـــــایە دڵ
بـەڵـکـــو لـــەدونیا بـــەنرخ تـــرە بـــاوەڕی بـــاری تـیـــایە دڵ
تـەماعـگـــەی خـــودی ئـیبلیـــس و شوێـــن کـەوتەکـانی تیـایـــە دڵ

★ ★ ★

کـــە کـانگـــای خـۆشەویـستـیە هـەرچـی هەیـە شوێن کەوتەیـــەتی
کـەبەخـــوا پــــڕ ڕووناکیـــــە خـــاوەنی دڵ ســـاغ بەنـدیـەتـــــی
کەلەشـــت شـــۆخ و جـــوان دەکـــەی تـــا نـیـــشانـی خەڵـــکی بـدەی
کـــەدڵەکەت ڕوانـــگەی خودایـــە بـزانـــە چـــی جـێـنـشین دەکـــەی؟

★ ★ ★

گـــەر لـەگـوناهـــێ چێـــژێ ئەکـــەی سـزای دڵـــی خـــۆت پــێ ئـــەدەی
چـــێژی کـاتـــی بـــەلەش ئـەدەی دڵـــت تـونـــد ئـەبی زیـنـدانـــی ئەکـــەی
وەك سەربازێ لـەشـەڕ ڕائـەکـەی خـۆت رزگـار ئـەبی و شا ڕیسوا ئەکـەی
ژان و ناسـۆری هاودەمـــی دڵ ئەکەی لەزیـنـدانێکی تـر زیـنـدانـــی ئەکـــەی

★ ★ ★

ئاوێنەك تێیدا سەیری خۆت ئەکەی گەرپیس بوو وەك گوڵ پاکی ئەکەی
دڵ ئـاوێـنـــەی لەش و دەروونـــە بەتـــۆزی تـــاوان بـــۆ پـیـســی ئـەکـــەی؟

کانیاوێـك تێیدا ئـاوی لێ ئـەخـۆی بە پـەرژینی پـاك پارێـزی لێ ئـەکـەی
دڵ کانـیاوی بـوون و ژیـنـتە بەبـەردی گـوناه بـۆ لێـڵـی ئـەکـەی؟

★ ★ ★

دەسا لەو عـومـرەی لەژیـنـت مـاوە لێ ی بەخـۆکـەوەو دەی هەسـتەپاوە
ژینت ڕوناك کە بەچـراکەی خـواوە ڕێ ی کەسێ بگرە بۆلای خـوا گەڕاوە
دڵ ئـاوەدان کـە بـەتـەقـوای خـواوە تەمـەن چـەند ڕۆژەو زۆری نـەمـاوە
بۆهەموو کەسێکیش مردن نوسراوە کـەکاتی تـەواوبوو دڵ ئیتـر وەسـتـاوە

★ ★ ★

دڵ دیـمـانەی دەوڵەتی دانـەری داهیـنـەرە
لەدەرگایـدا دێـدەوان بـە دژی چـی داگیرکـەرە

# وانەی وەرزەکان

هەر ساڵێکمان کەچوار وەرزەیە
پێناسەی ژیانە بۆهەرچی زیندەیە
هەرچوار قۆناغی تەمەن بەندیە
لەگەڵ وەرزەکان هاو ڕووی سەندیە

***

زستان کەساردەو پڕ زەحمەتی یە
قۆناغی منداڵی و گریان و کۆستی یە
ئینجا بەهاری سەوزو جوانی یە
قۆناغی لاوی و تین و شۆخی یە

***

بەڵام ئەم جوانی یە هەتا سەر نی یە
بەهارو لاوی وەرزی کورتی یە
ئینجا هاوینەو بەرەو ووشکی یە
زەرد هەڵگەڕانی سەوزایی زەوی یە

***

قۆناغی پیری و چرچ و لۆچی یە
لاوازی لەش و نزیکی کۆچی یە
کۆچی مەرگەو بەرەو چۆڵی یە
هەروەك گەڵاکان لەپاییز کەوتیە

***

خـــۆ ئەگـــەر مـــردین و هـــەر مـــردن دەبـــوو
زیندووبوونـــــەوە و دوا ڕۆژ نـەدەبـــــوو
ئەوکاتـــە مـــردن هیـــواو خـــۆزگە بـــوو
ئاواتـــی هەمـــوو زینـــدووەك دەبـــوو

***

بـــەڵام هـــەم دیـــسان وەك گیـــاو دارەکـــان
بـــەئاوێ دەڕوێـــین و دەردەچـــین لـــەخاکان
ئینجـــا لەســـەر گـــشت ڕەفتـــارو گوفتارمـــان
لێمـــان دەپرســـرێ گـــەورەو بـــچووکمـان

***

وەرزەکـــان وانـــەن بـــۆ ووردبوونـــەوە
وێنـــەی واتـــادارن بـــۆ ووشـــیاربوونەوە

# شاگوڵ

دونیـــــا بەوێنــــــەی باغێـــــك كاڵـایـــــە
جـــوانی و ڕەنــــگ و بـــۆن نەخــــشی خودایـــە
گوڵانێــــــك دەبینـــــــی سەریـــــان واڵـــــایە
لەهــــــەموو دەســــــتێكن بۆنیـــــان نـەمـایـــــە
هــــــەروەكو تەڵــــــەن گـرتنیــــــان بـەڵـایـــــە

بـەڵــــــام شاگـوڵــــــی بـاغــــــی گەڵــــــادار
بۆتـاكــــــە دەســـــــتی پـاكــــــی بــــــاوەڕدار
بـاڵــــــا بۆشــــــەو وا لەبــــــەرزی دایــــــە
بــــــەم سەرپـۆشــــــەی وا بـەســــــەری دایــــــە
جیایــــــەو جـــــوانی خـــــۆی وا حەشــــــاردایە

***

گـەر شازادەی شـا ڕێـگـە بـگـرە تـا بەشـاگوڵ دەگـەیت
بەشـوێن شمـشالی شـلێوە مەچـۆ تووشـی شـەرمەزاری دەبیـت

# تەوبە

هـــــەر تەوبـــــە دەرمــــانی گـوناهـــــو ژەنگـــــە
هەتـــــا زوو بیکـــــەی هێـــــشتا درەنگـــــە

ئـــــا لـــــەم ڕۆژگـــــارەی تاریـــــك و تەنـگـــــە
کەشـــــتی ڕزگـــــاری نێـــــو دەریـــــای لـەنـــــگە

هەرکەســـــێ ژیـــــرو زیـــــت و چـەلـــــەنگە
فریـــــای خـــــۆی کـــــەوێ لەگـــــەڵ ئـــــەم زەنگـــــە

خـــــۆ گـــــەر ڕازی بـــــوو بـــــەم شـــــەوە زەنگـــــە
دەی ئەمـــــە نەفامـــــەو زۆریـــــش دەبەنگـــــە

ژیانـــــت لەدونیـــــا هـەلێـــــکی گـــــرنگە
ســـــاتی تەوبەکـــــەت لای خـــــوا بـەسەنگـــــە

هەنـــــدێ کـــــەس لاوە و بەشـــــۆخ و شـــــەنگە
نـــــازو فیـــــز دەکـــــات کـەسپـــــی ڕەنـــــگە

بـــــێ ئاگاییەکـــــەت ئـاوێـکـــــی مـەنـــــگە
مـــــردن لـــــەپڕدێ و بـــــۆ جوانـــــە مەرگـــــە

***

تاریکـــی تـــاوان بەتـــــریفەی تـــــەوبەکەت تـوڕدە
تەمیـەڵی و تـەما بـۆ تەشـەنەی تەقـەڵ یـێ سـوودە

# بێ ئاگایی

زۆر کەس دێتە نێو ئەم دونیایە
دوو ڕاستی لێ وونەو لێی بێ ئاگایە

***

یەکێکیان ئەوەیە کە دوژمنداره
دوژمنیش ئیبلیس و کەسێ لەجەنگایە

***

ئەوی تر مردنەو ڕاستی یەکی تاره
کەسێ نەیبێ دین ژینی فەوتایە

***

هۆی بێ ئاگاییش لەم هەردووباره
بوون بەکویلەو بەندەی دونیایە

***

بۆ ڕزگاربوونیش لەم بارە خواره
چارەی هەریەکەو دووی بەدوانایە

***

بەرهەڵستی کردنی نەفس و زۆرداره
بەنیازی خوداو بەهەشتی هەتایە

***

بێ ئاگایی لەبنەڕەتدا بۆسەو بەڵای بای تاغووتە
یەددم بانگی بەدرۆ مەرۆ بوخچەو بۆمبی پڕ بارووتە

# ببمە خاکی ژێر پێت

چ ڕۆژگـــارێکی ڕەش بـــوو، بەســـەر مـــەردوم هـــاتبوو
گێـــژە لوکێـــکی تاریـــك، پـــڕ غـــەم و تـــەم و مژبـــوو

چ ئاستێکـــی نـــزم بـوو، ڕەوشـــت بـــەخۆی بینـــی بـــوو
ژیـــانێکی ئـــاژەڵ ئاســـا، گەرچـــی دارستـــان نـــەبوو

چ دەریـــایـــەکی لێـــڵ بـــوو، ئافـــرەتی تێـــدا وێـــڵ بـــوو
شـــەرمـــەزاری بـــوو بـــوونی، بـــەلایان مـــرۆڤ نـــەبـــوو

چ ژان و ئازارێـــك بـــوو، بـــۆ کۆیـــلە پـــاروو نـــەبوو
پێـــستی ڕەشـــی بەرهـــەتاو، لەگـــەڵ ســـێبەر شـــەڕی بـــوو

چ گۆڕانێـــك بـــوو ڕوویـــدا، کاتـــێ نـــور لەدایـــك بـــوو
ڕوونـــاکی بـــوو بۆمـــان هـــات، تاریـــکی جێـــگەی لـــەق بـــوو

چ دادو یەکـــسانـــی یـــەك، بـــۆمان هـــات و نـــازل بـــوو
کوفرو زوڵـم و بـەد ڕەوشـت، دەسـت و کورسـی تەخـت بـوو

چ گـەورەیـــی و بەهایـــەك، بـەیاســـاو بڕیـــار دەرچـــوو
لـــەڕێزو مـــاف و حورمـــەت، ئافـــرەت پـشکـی شـێری بـــوو

چ دەرگایـــەك کرایـــەوە، بـــەڕووی بەنـــدە کەبەنـــدبـــوو
کـــەبووبە بەنـــدەی خـــودا، بووبـــە شـــاو دڵـــی خـــۆش بـــوو

چ زیندانیـکـــــی ســــەختە، دڵـــــێ دینـــــی تیـــا نـــــەبوو
دیـل و سـیس و ژێـر دەستــە، بـا ســەرۆك و لیــواش بـــوو

چ فــەخرو شـــانازی یـــە، بـــۆ بـــیلال کەبانگـــــدەر بـــــوو
خەڵــکی بانگکـە بۆنوێــژێ، پێغەمبــەر تیـــا ئیمـــام بـــوو

چ خەندەیـــەکی گـــەش بـــوو، بـــەڕووی حـــەمزە بینرابـــوو
کـــاتێ کەڕەحـــی وەحـــشی، لەپـــشتی چـــەقـــێنرابوو

چ میـــسك و عەنبـەرێـــك بـــوو، لـــە ئـارەقـــەت گیـــرابـــوو
پرســیارکەن لــە (أم معبــد) هـــەواڵ هـــەر لـــەلای ئـــەوبوو

چ بـــاڵێکی شـــاکەڵ بـــوو، بـــە جەعفـــەر بەخـــشرابـــوو
کـــاتێ لـــەگەرمـــەی جیهـــاد، بـــاڵی بـــەردی ئـــاڵـــا بـــوو

چ کانیاوێکـــی ســـۆزبوو، (صـــدیق) دڵـــی پـــێ تـــەڕبـــوو
کـــاتێ پێـــت ووت (لاتحـــزن)، خـــوداش بۆتـــان سێیـــەم بـــوو

چ سوکنـــاییـــەکـــی نـــەرم، بەســـەر (أحـــد) نـــازل بـــوو
کـــاتێ بەســـەر پـــشتیـــدا (أثبـــت أحُـــد)ت فـــەرموو

چ بـەرزی یەکـە بـۆ ڕووی مـن، کـەخاکی ژێـر پێـت دەبـوو
ڕووم بـۆ ژێـر پێـت ڕایەخـە، بـۆ هاتوچونـت فـەرموو

زینـدانیم شـانازی یـە، کەبـۆ بـەرگری یـە لەتـۆ
ژیـانم بـەقوربانت بـێ، تـۆش لـەقیامەت بمگـرە خـۆ

***

تۆ لەباخێکی باڵادا،
من بەرێی یەکی بـەدکار چۆن پێـت بگـەم
تۆ لەبەرزاییەکی بڵندا،
مـن لـەبیابانا بـێ سـەرو شـوێنم چـی بکـەم

# غوربەتی تاوان

خودایـــــە پـــەنا بەگـــەورەیی تـــۆ دەگـــرم خودایـــە
هـــــانام بـــــۆلای تۆیـــــە تـــــۆ غـەفـفـــــاری

لـــێم ببـــورە مـــن بەڕەحمـــەتت ئومێـــدم مایـــە
بم بەخـــــــشە لـــــــەو گونـاهــــــــە زۆرەی

لـــــەو تـەمــــەنە کورتــــەی ئەنجامــــــم دایـــــە
خۆمـــــــن ئێـــــــستاش شوێنـــــــــەواری

گـوناهــــــو تـــــاوان لەســــــەر دەروونم مایــــــە
خــــــودایە کـــــــەوتومە نێـــــــو شــــــەرمەزاری

هەڵـــــەی گفـــــت و ئـــــەو ڕەفتــــــارەی ناڕەوایـــــە
لەمــــــــنت بیـــــــستوەو خـــــــۆت دەزانـــــــی

چـــــیم ووتــــــوە و چ خەڵکێـــــکم ئــــــازاردایە
خەجاڵــــــەتبارم لـــــەو کـــــردارە ناپەسەنـــــدەی

بەبەرچاوی تۆ کردوومەو لەخەڵکیشم حەشاردایە
خودایە گەر تۆ لێم خۆش نەبی

جگە لەتۆکێ دەمگرێتە خۆ؟ هەرتۆی خودایە
لەدونیای تەنگ و غوربەتی خەڵکی

ڕقم لەخۆمە هیوام بەهیچ کەس نەمایە
خۆت خاڵق و گەورەی گەردوونی

ڕۆژی دەری هەرچی لەم زەوی یە دایە
خۆت ئاگاداری باری مەردومی

دەسا لوطف و ڕەحمەتێکی تۆم داوایە
دەرووێک بەڕووی ئەو هەژارەی
وا لەزیندانەو تەنها پشتی بەتۆ دایە

***

گەر غیرەتی تاوانکاریت لغاو نەکەی
لەغوربەتدا دەتژێنێ و غوبار دەکەی

# زەنگێك بۆ زانایان

زانـــــاو دانـــــایان مەشـخەڵـــــی ڕێگـــــەن
بـــۆ ژیـــن هـــەوێنن هـــەم خـــاوەن پێگـــەن
بـــۆ گـــەرمای ژینمـــان ئێـــوە خێوەتگـــەن
ســـوێری یەكـــەی دەریـــان ئـــەگینا بۆگـــەن

* * *

خـــاوەن پایـــەو ڕێـزێـكـــی گـــەورەن
هـــەڵگری زانـــست و ســـەركردەی ئـــەورەن
شـــادەماری دڵـــی گـــەل و كـۆمـەڵگـــەن
دوگمـــەی ئـــەمانی تیاچوونـــی گـــەورەن

* * *

ئێـــوەن بـــۆ خـــەڵكی زانكـــۆو مـەدرەســـە
ئاكـــارو ڕەفتارتـــان بـــەر لەقـــسە دەرســـە
ژیانتـــان بـــۆ نـــەزان تـــابلۆو ئـەدرەســـە
كەســـێ دژتـــان بـــێ دۆڕاو و مـوفـلیـــسە

* * *

ئـــەركی سەرشانتـــان قـــورس و گرانـــە
بەفـیتـــــنەو بەڵـــا دەورە درانـــە
سروشتـــی كـــارتان ئـــێش و ژانـــە
شەونخوونـــی یـــەو قوربـــانی دانـــە

* * *

زانـــــــا میراتــــــــگری پـێغەمبــــــــەرانە
إبـــــــراهیم و محمـــــــد ســەرمــەشـقـتـانـــــە
مــــــیرات و مـــــەتاعتان زانـــــستی قـورئـانـــــە
رێنمـــــوویی خـــــەڵك بــــۆ ئــــەم چـراخانــــە

★ ★ ★

زاناكــــــان ووشــــــیاربن لــــــەم دەورو زەمانـــــــە
لـــــەم گەلـــــە گورگـــــەی لەپێـــــستی مــــەڕ دانـــە
نەكەونــــــــە داوی ئینـــــــسانیی شەیتانـــــــــە
داویـــــان بـــــۆ ئێــــوە تـەمـاعــــــی دانـــــە

★ ★ ★

تەماعــــــــی پـــــــارەو دەعــــــــوەت و نـانــــــــە
بەفـــــەرموو مامۆســــــتاو رێـــــزی زمـانـــــــە
خـــــــودا زانـــــــایە چــــــی لەدڵیــــــانە
پـــــــڕ رق و قینـــــــــەو لـــــــــەبۆسەدانە

★ ★ ★

ئاورێــــــك بدەنـــــەوە لەمێــــــژووی ڕوناكتـــــان
لەحاڵـــــــی زانـــــاو پێـــــشەوای خۆتـــــان
چـــــۆن هـــــەوڵیان داوە گەلــــــی تـاغـــــوتان
كـــــەم كـــــەن لەشــــكۆو بەهاكـــــەی دینتـــــان

★ ★ ★

بـــەڵام زانـــای پـــاك نیـــازی پـــاك مـــاوە
بۆیـــە زوو دونیـــای تـــەڵاق و تـــوڕ داوە
لەبـــەردەم دەرگـــای شـــاكان نـەشكـــاوە
لـــەڕیزی هـــەژارو لێقـــەوماو هـەرمـــاوە

* * *

هەنـــدێكیش هـــەبوون هـــەروەكو ئـــەمڕۆ
لەبـــەردەرگا بـــوون بـــۆ پـــول و یـــۆرۆ
بـەرگـــی ڕاستیـــان دەكـــردە بـــەر درۆ
تـــا لـەهـــەردوولا بوونـــە ڕەنـــجەڕۆ

* * *

بـزانـــە هـەركـەســـێ لـــەم زانـایـانـــە
ببینـــرێ لەبـــەردەم ئـــەم دەرگـایـانـــە
دڵنیـــابن دزەو لـەبـــەرگی دینمـــانە
دونیـــای مـەبـەستـــە بۆیـــە هاودەمیانـــە

* * *

گـــەر حـاكـــم و پادشـــا خـــراپ و زۆرداربـــوو
گـــەل و خەڵكیـــشیان بـــەلا ڕێ داچـــوو
تـــۆش دڵ ئاســـوودە و جێگـــەت نـــەرم بـــوو
بزانـــە لاتـــداوە تـــۆ وەك زانـــای جـــوو

* * *

ئێــــوە وەك خــــوێ وان بۆســــاغ مــــانی گـــــەل
گـــەر ئێــــوە تێكــــچوون بـــەكێ دەكـــرێ حـــەل
ووریــــــای خـــــۆتان بـــــن لـــــەداوی چـەقــــەل
خــــەڵك ووشـــــیاركەن ڕاونـــــەكرێن وەك مــــەل

★ ★ ★

مـەرجـــــــی ووتـــــارو ســــــەر مینبـــــەر كــــەوی
تــرســـــــانە لـــــــەخوا و لــــــــەهەق نەســـــــرەوی
گــــــەر شایــــــەن نـەبــــــووی دەبــــێ لاكـــــەوی
كـــــەسی باشــــتر بـــێ و تـــۆش بـــەدوای كـــەوی

★ ★ ★

گــــەر هـــەقت بـــەیان كــــرد كـــە ئـــەرك و پێویـــستە
لەكــــــەس مەترســـــەو پـــــشت بەخــــوا ببەســـــتە
هـــــــەردەم بوێـــــــری و خـــــــۆگریش شـــــــەرتە
تـــــا دەگــــــەی بەئەوبـــــەر كـــــەدەرگای بەهەشـــــتە

★ ★ ★

گـــــەر تـــــۆ نەچـــوویە ژێـــربـــــاری تـەمـاعیـــــان
بــــــێ شـــــــك دەگـــــۆڕن شـــــێوەی ڕەفتـاریـــــــان
بەتـــــــرس و هـــــــەڕەشە، دەمـــــــامك داریـــــــان
دەنێـــــــرنە ســــــــەرت بـــــۆ نێــــــو زینـــــــدانیان

★ ★ ★

سروشتـــــی ڕێگاکـــــەش هـــــەر ئەوهـــــا بـــــووە
أنبیـــــاء و علمـــــاء حاڵیـــــان هـــــەروا بـــــووە
گـــــەر هیـــــواو ئاواتـــــت کۆمـــــەڵیان بـــــووە
بـــێ شـــك تووشـــت دێ چـــی تووشیـــان بـــووە

* * *

ئـــــەوەی ووتوومـــــە تـــــۆ گوێـــــت لێ بـــــووە
لەبـــــەر دونیاکـــــەت بـــیر خـــۆت بـــردووە
ئەمـــــەش زەنگێکـــــە هەرچەنـــــد کـــپ بـــووە
بۆهـــــەموو کـەسێـکـــــە دڵەکـــــەی زیندووە

* * *

کـــەتاجی زێڕینـــی زانـــست لەسـەر دەکـەن
چـــۆن زیـــارەتی زۆنگـــاوی زۆردار دەکـــەن

# دایە گیان

هـــەر تـــەنها بـــەناوی تـــۆ ئـــەی خودایـــە

هـــــاوارم بۆتـــۆیـــــە، هەرتـــــۆم پـــــەنایە

مـــن لەشــــوێنێکم وەك دەنــــگم نایـــــە

بـــێجگە لـەشیـــعرێ چـــم لـــەدەست نـایـــە

****

ســـوێند بـــەخوا لەشـــیعرم بەســـەر دایـــە

زمــــــانم لاڵـــــەو ووشـــــەم بۆنـایــــــە

مـــن تـــازە شیعــــرم لـــەسەر دانـــایە

کەچـــی ئـــەو بەمـــن ژیـانـــی فـەوتـــایە

****

مـــن شـــەرمەزارم بەڵکـــو ڕووم نـــــایە

کــــەچی ئــــەو هــــەروا لەبـــەرزی دایـــە

مـــن بـــێ وەفـــاییم بـــێ حـــەدو سـەدایـــە

چ بکـەم چـۆن دەرچـم لـەم هـەموو خەتایـە ؟

****

هـــەربیرو خـــەیاڵێك یادێـکـــی بەدوایـــە

هەریادێـــــك ژانــــەو ژیـــن لـــێم بـەڵـــایە

منـــداڵیم، گـــەنجیم، تـەمـــەن بـەزایـــە

تـاڵـــی زەرەنــــدەو تـــامی هەرمـایـــــە

****

لەدەستەو سانم سەرم سوڕمایە
تۆ هەر چاوەڕێ، بەئومێدبووی دایە
لەکاتی هەژاری و بێ سوکنە و سایە
پاشەکەوتت کرد پارەو سەرمایە

****

خۆت فەرامۆش کرد لەزینەو پایە
بۆمنت بوو منیش، بۆت نەبووم دایە
تا پێم گەیشت لوطفی ئەم خوایە
خستمیە سەر ئەو، ڕێ یەی ڕەوایە

****

ڕێ ی ئیسلام کە أحمد، سەروەرە تیایە
ڕێ ی حورمەت و ڕێز، بۆباوك و دایە
ئینجا بۆکارێك سەربەرزم تیایە
پاشان زیندانیم بۆ هەتا هەتایە

****

هەرچەم بەسەرهات لەپێناو خودایە
هەرئەویش ئارامی بەمن و تۆ دایە
بەڵام وەك باوکم تۆش لەم دونیایە
بێ ماڵئاوایی جێت هێشتم دایە

****

ئـــەو تەلـەفـۆنـــەش ســـاردو سـرِمـايـــە

كـــەدەنگ و دوعـــاى تـــۆى تێـــدا نـەمـايـــە

خۆزگـــە دەمتـــوانى پـــێش بـــرِۆى دايـــە

بۆجارێـــكيش بـــا لەئامـــێزم بـگـرتـــايە

****

چـــى بكـــەم كەئـــەوەش قـــەدەرى خـوايـــە

هـــەردووكمان بـەنـديـــن وا لـــەم دونـيـايـــە

من لەژێر دەستى ئەو گورگەى ئاغايـە

تـۆش لـەژێر خـاك و رِەحمـى ئـەو خـوايـــە

****

داخـــى دڵـم لـەدووريت دروێنـە بەعـــومـــرم دەكـــا

دامـــاوى و دەســـتەو ســـانيم دەرفـــەتم لێ زەوت دەكـــا

# بابە گیان

بـابەگیــــان تــــۆ هـــــەر لـەیــــادمی
تـــــۆ لـەنـێــــو دڵ و لـەویـژدانـمــــــی
تــــۆ ئـاوێـــــتەی ژیــــن و ژیـانـمــــی
تــــۆ لەخـــــەون و هـــــەم لەخەیاڵمـــــی

***

لـــــەدوای گیـرانـــــم هاتیــــە سەردانــــم
لـــــــــەدوای (الله) تـــــۆی پـــــــشتیوانم
ووتـــــت کــوڕی خـــۆم زۆربـــاش ئەزانـــم
لـــــەپێناو خودایـــــە خۆگربــــە بـاوانــــم

***

لەکەلێنـــــــی دەرگــــای ژووری تەنیـــــام
دەریایــــەك غــــەم بـــوو منیــــش لـــەبنیام
کـــــە دەردەکـــــەوتی لـــەڕۆژی سەردانــــم
شـــەپۆلێك غـــــەم بـــوو نەیـــدەبرد گیـــانم

***

لەکـلێپــــــەی گەرمـــــی غــــەمی هـەنــــاوت
ئەســــتەم بــــوو بڕوانمـــــە گلێنـــــەی چـــاوت
کـــــە دەڕۆیــــــشتی بەهەنـــــگاوی خـــــاوت
بەشەرمــــــــــەزاری دەمهێنـــــــا نـــــــاوت

***

لەگـــــەڵ دایکـــــم چەنـــــدین ساڵتـــــان
بـــەڕێ کـــرد بەغـــەم نـــەبڕا ئومێـــدتان
جـــەژن بـــۆ جـــەژن چـاوەڕێ بـوونتـــان
ئـــاخیری غـــەم بـــوو نەهاتـــەوە کوڕتـــان

***

هەناســـەی ســـاردی پـــڕ پـەرۆشتـــــان
دیـــسان هاتـــەوەو بوویـــەوە بەشتـــــان
بابـــەگیان مەگـــەر خـــودای مەزنتـــــان
جـــــەبری کەســـــرکە دڵ و دەروونتـــــان

***

ووتیـــان ڕۆژێکیـــان یەکـــێ نـــزای کـــرد
دوعـــای بـــۆتێکڕای ســـجنەکان دەکـــــرد
تـــۆش بـــەبێ دەنگـــی فرمێـــسکت دەڕشـــت
بـــەدڵ ئـامینـــت بـــۆ نـــزای دەکـــــرد

***

دوعـای تـۆ بابـە بـۆ کـوڕی خـۆت بـوو
کەچـــەندین ســـاڵە لـــەتۆ دووربـــوو
بابـــەگیان چـی بکـــەم کەدەستـــم کـۆت بـوو
خزمـــەتم نـــەکردی و مردنـــت ڕێـــت بـــوو

***

بەربەستی بەنـدیم بـواری نـەدام بـۆ وەفـا
بـەڵای بـەدیم بیابانێـک بـوو لـەجـەفـا

# ڕێزی ڕێزگر

سـڵاوو ڕێزەکـــەم پـــێش کـەشــت بـــێ
بەوکەســـــەی قـــەدری ڕۆژوو دەزانـــــی
خـــودا پـــشت و پــــارێزەرت بــــێ
لـــەم دونیـــا پانـــەی لێـــت بـــۆتە زینـــدانی

***

ئـینجـــا یاخــــوا پیــــرۆزت بـــێ
ئـــەو مانگـــەی هـــەر خـــوا قـــەدری دەزانـــی
بـــۆ ڕۆژوو وتەراویـــح توانـــا دەرت بـــێ
هـــیچ خێرێـــك لـــەم مانگـــە بەکـــەم نـــەزانی

***

نیـــازو مەبەســـتت پاداشـــتی خوابـــێ
هـــەر خێرێـــك شـــاخێکە لـــەناو میزانـــی
یـاخـــوا دڵـــت هـــەروا گـــەرم بـــێ
دووربـــی لـەتـەڵـــەو داوی شـــەیتانی

***

ڕایـە تـۆ ڕامەوەسـتە ڕۆح ڕقـی لـەڕاڕایی یـە
ڕەنجـی بێ ڕێنمـایی ڕەهێڵـی ڕەشایـی یـە

# یادت پیرۆز ئەی دڵسۆز

لەدایك بوونت فەخرە
وەك چەترە بەسەرمەوە

لەکونجی زیندانەکەم
بەیادت شاد دەبمەوە

یادت بەستایشی خوا
دەست پێ دەکەم پێشەوا

هەروا بەسوژدەی شوکر
سەرم دادەنێمەوە

لەبەرزی غاری حیرا
بووی بە پەیامبەری خوا

بۆیە تا لەژیاندابم
قورئانت ئەخوێنمەوە

بەدڵسۆزیەکی بێ گەرد
پەیامت بەمرۆ گەیاند

ماندوو نەناس هەولتدا
جێگاکەت پێ چاپەوە

ژیـــان بـــەر لەهـاتنـــی تـــۆ
وێنـــەی جەنگەلـــستان بـــوو

تـــۆ مانـــات بـــەژین بەخـــشی
ئـــــارامی گەڕایـــــــەوە

تـــۆ بـەڕوناکـــی هـــاتی
لەنـــاوت بـــرد تاریکـــی

بـــۆ کۆیلـــەو چەوساوەکـــان
ئازادیـــــت هێنایـــــەوە

أبـــا الـقاســـم مُحَمَّـــد
ئـــەی أحـــمدی مـــختار

ئـــەی ڕابـــەرو ئـــەی لابـــەر
کوفـــر بـــەتۆ ســـڕایەوە

خامـــەم خەجاڵـــەت بـــارە
چونکـــە تـــۆ بـــەرزتری

غـــەمم بەتاڵـــی خـۆمـــە
لەشـەرمـــان دەتـــلێمەوە

وا دیـــــــسان بــــــێ بـــــــاوەڕان
بــــــەکلکی نــــــاوخۆو عەجـــــــەم

بەنـــــــاوی بـــــــێ نـــــــاوەڕۆک
وا ســـــــــەریان هەڵـــــــــدایەوە

بــــــەزوڕناو بـــــوقی ســـــــەردەم
بەکـــــــــەناڵ و بەقەڵـــــــــــەم

بــــــــەئیعلامی بـۆگـــــــــــەنیان
ژەهـــــــر یـــــــان وا ڕژایـــــــەوە

بـــــــەیادی ســــــــەری ســـــــاڵ و
ڕۆژەکـــــــــانی ڕۆژئـــــــــاوا(*)

خـــــــەڵکی لەتــــــــۆو لـــــــەیادت
دوورە دوورخرایـــــــــــــــــــەوە

لـــــەم بـــــارە پـــــڕ فەســـــادە
بـیـــــــژی بـۆتـــــــە شـــــــازادە

چـــــی بکـــــەم ئـــــەی دڵـــــسۆزەکەم
کـــــــەتۆ بـــــــۆمان نایـــــــەوە

---

(*)وەکو ڕۆژی ئافرەت، ڕۆژی ئاڵا، ڕۆژی دایک،.........هتد

یـــــادت لـــــەنێو ئـــــەم خـەڵکـــــە
تــــــەنها شـــــێوەو ڕواڵەتــــــــە

بـــــــــازاڕ پــــــــڕ لەتـــــــاوانەو
بەکاغـــــــــــەز ڕازایـــــــــــەوە

چـــــاکترین کــــــار لـــــــەم یــــــادە
بەرهـەڵـــــــــــستی فـــــــــەسادە

دڵ و گـیـــــــــانی مـُخـــــــــمّد
ئیتـــــــــــر دەدرەوشـــــــــــایەوە

دەســـــا خـوایـــــە لــــــەم یــــــادە
فرکــــــــە هـــــــەرچی جــــــەللادە

ئــــــەوسا ئۆخـــــەی دڵـــــم دێ و
دەڵـــــــێم گــــــەل حەسایـــــــەوە

***

یـــادت یـــەکجاری یـــە یـــاقووت و یاسەمینـــە
یـــادت لەیەخـــسیریم دا یـــاوەریکی ئەمینـــە

# بزەی بەیانی

لەبەیانیا لەمزگەوتا بانگدەر بێ دەنگی شەو ئەتارێنێ
بەیانی یەو تیشکی ڕۆژیش بەئاسۆدا مژدەی ڕۆژێکی نوێ دێنێ

* * *

لەبەیانیا نوێژێ بکە دەم بەقورئان دڵ ئاوەدانە
بەیانییەو تۆتەنیانی بەمەلائیکە زیارەتکراوی بۆ بیستنی ئەم قور ئانە

* * *

لەبەیانیا ئەسپەکانی پیاوانی خوا بۆسەر دوژمن هێرش دەبەن
بەیانی یەو مژدەی فەتح و بانگی سەرکەوتنی نوێ ئەدەن

* * *

لەبەیانیا قوتابیانی ڕێگەی خودا بۆ حوجرەکانا هەنگاو ئەنێن
بەیانی یەو شەیدایانی بەهەشتی خودابۆگوفتاروکاری ڕەوا سروود ئەڵێن

* * *

لەبەیانیا باڵندەکان بەسکی برسی لەهێلانەکانا دەرئەچن
بەیانی یەو لەگەڵ دەنگی بولبولەکانا خوێندکاران بۆ وانە ئەچن

* * *

لەبەیانیا چاو بەجوانی چوونە دەری مەڕو ماڵاتا تێر ئەبێ
بەیانی یەو گوێ بەدەنگی کەڵەشێرو بەرخەکانا سوکنایی دێ

* * *

لەبەیانیا لەماڵ دەرچە بۆ بەدەست هێنانی پاروە نانێ
بەیانی یەو بەرەکاتی خوا دەخرێتە نێو کارو ڕۆژی زۆر کەسانێ

* * *

لەبەیانیا لەزیندانا ئومێدی نوێ بۆ ئازادبوونم دێتە ڕێ
بەیانی یەو کە شەو ئەما بەویستی خوا ئەم ئومێدەشم هەر دێتەجێ

* * *

بەستەڵەکی بەیانیان بەهێزی باوەڕ بشکێنە
لەبۆگەن بوونی بێشەت بڕو بیانوو مەهێنە

# سپی و ڕەش

ڕێگـــای بەهەشـــت ناخۆشـــە بـــەس بـــەرەو بـــەرزایی یـــە
ڕێگـــای دۆزەخـــیش خۆشـــە بـــەس بـــەرەو لێـــژایی یـــــە
ڕێگـــــــای بـــــاوەڕ دژوارە پـــــــڕ لەئـــــــاسوودەیی یـــــــە
ڕێگـــای باتـــڵ بەتاڵـــە دڵ بـــێ ئۆقـــرەو تـــەنـگـــی یـــــە

* * *

چـــــاکەکاری ئاســــانە بۆکەســـــێ بەنـــــدەی خوایـــــە
کەســـێ نـــەریتی خـــراپ بـــوو بۆکـــۆی خـــەڵکی بەڵایـــە
باڵـــا پۆشـــی خوشـــکانم گـەوهـــەری کـۆمـەڵگـایـــــە
ڕووتـــــی و لارو لەوێـــــری فتنـــــەو دەردی بەدوایـــــــە

* * *

ڕاســـتی ڕێگـــەی ڕەوایـــە لـــەگـوفتـــارو بـــەڵێنمــــــان
ڕوو ڕەش و مایـــە پووچـــە درۆزنـــی گـــەنج و پیرمــــان
ئـــیش و کـــاری حـــەڵاڵمان خێـــرو بێـــرە لەماڵمــــــان
خێـــزان پڕکێـــشەو ئێـــشە بـــەهۆی پـــارەی حـــەڕامان

* * *

ئـــاوی ڕووبارەکـــــان و شـیلـــەی میـــوە جاتـــەکـــان
بـــۆ ملـــی ئـــارەق دەگـــری و دەچیـــە ڕیـــزی ئاژەڵـــان
هـــۆش و هـــزرت خەڵاتـــە بناغـــەی ڕێـــزو حورمـــەتان
شـــێت و گێـــژو هێڕکـــەرن هۆشـــبەرو حـــەب و قـــەتران

* * *

لەگـەڵ کـڕین و فرۆشـتنت مـاڵ ببەخـشە زیـاد دەبـێ
سـوو خـۆری جـاڕی جەنگـە سـەرمایەت لەناودەچـێ
هـەژار ناسـی نـان بـدە لەدونیـا بەهەشـت دەکـڕێ
دونیـا مـولکی قرچـۆك بـێ هـەر هـەژارەو هـەر دەمـرێ

★ ★ ★

زانـست بـۆ ژیـن چـرایە بەرچـاوت ڕوونـاك دەبـی
تـا لـەزانایان دووربـی لەگورگـان نـزیك دەبـی
زانـستی زۆر زەرووره بـۆ دەوروبـەر بەسودبـی
تـەقواو کـردارت نەبـی وەك زەرەنـدەی تـاڵ دەبـی

★ ★ ★

چـاکە بەکـەم مەزانـە بەلەتـە خورمـایەکیـش بـوو
جیهـادو حـەجیش مەکە گـەر خـوات پـێ مەبەسـت نـەبوو
یـادو ذیکـری خوداکـە بـا هەتبـێ دڵێکـی زینـدوو
گـەر ڕقـت لـەذیکربـوو دڵـەکەت مـردووە مـردوو

★ ★ ★

دادپـەروەری و یەکـسانی ئـەمـانی مـانی ژینـە
ناهـەقی و زوڵـم و جیایـی زەنگـی وێـرانی و شـینە
بـێ دەنگـی تێفـکرینە سـەلامەت سـەرو دینـە
برینـی قـسەو زەمـان سـاڕێژ نـابێ بـەپینە

★ ★ ★

شـــووکردن و ژن هێنـــــان بـــژاردەی پــــاکە بـــۆمـــانتـــــە
زیـــــناو چـــــاودەری ماڵــــان زێـــرابــــی دەردو ژانتـــــە
تەوبـــەو پەشـــیمان بـــوونـــــت ڕێـــــگای ڕزگـــاری بـــــوونتە
لـــەگوناه بـــەردەوام بوونـــت ناســـۆری لـــەنـــاو چـــوونتـــــە

★ ★ ★

بگـــەڕێوە بـــۆ بنـــەچـــــەت بـــــاوە ئـــــادەم، تـــەوبـــەکـــەی
گـــەرتۆ وانەکـــەی بـــێ شـــك لاســـــایی ئیبلیـــس دەکـــــەی
دونیـــا کورتـــــەو بزانــــە چـــۆن خـــوداگـــــەت ڕازی دەکـــــەی
گـــەر گێلانـــە بـــەڕێت کـــرد لـــەنێو گـــۆڕدا چـــی دەکـــەی ؟

★ ★ ★

سـپێدەی سـەرباز سـۆراغی سـەکۆی سـەربەرزی یـە
ڕاوگەی ڕێــــوی ڕەوشــــی ڕەشــــی ڕیسوایــــی یــــە

# ڕۆژئـــاوا

لـــەم سـەردەمــەی دەبینـــی ڕێـــزو ڕاســـتی نـەمـــاوە
باوبـــــاوی ناکــــەس بـــەچەو ڕومیبیـــزەی نــــاپیاوە
دانـــا لـــەم بـــارە شـــۆکەو دامـــاو و حەپەســـاوە
گـــەنجانیش ســـەرگەردانن تـــەواو لێیـــان گـــۆڕاوە

★ ★ ★

ڕۆژئـــاوا بـــۆ ئـــەم گـەلـــە هــەزار تـــەڵەی دانـــاوە
پڕوشـــکی پـــشکۆی ئـــاگرن بـــۆ هــەر فیتنـــەو ئـــاژاوە
چـــی پیـــسە لـــەڕۆژئاوا بـــۆ ئـــەم خاکـــە هێنـــراوە
هەرچـــی کـــانزای بەنرخـــە بـــۆ ڕۆژئـــاوا بـــردراوە

★ ★ ★

ڕۆژئـــاوا دەمامکـــداره ڕووی ڕەشـــی بـــۆیە کـــراوە
ڕەش پیـــسی هــەناو ڕزی بــەرگی ســپی لەبــەر کــراوە
وەك سەگێکـــی گـــوڕووە و بـــەمامز نـاسـێنـــدراوە
هـــەر دەســـتێك بـــەرزبووبێ چـــەقوێکی نیـــشان داوە

★ ★ ★

ڕۆژئـــاوا پیـــشەسازی و گـەشـــت و گـــوزارو نـــاوە
بـــەڵام نـــاوەڕۆك بـــۆش و زینـدانـــی دڵ و هەنـــاوە
بـــاوو بازاڕگـــەی ڕەش و بەرژەوەنـــدی یـــەك چـــاوە
قـــەیرانگای بـــەهای بـــەرزو ڕەوشـــتی جـوانـــی لاوە

★ ★ ★

ئاشـــتی لـــەلای ڕۆژئـــاوا ئـاژەڵـــێکەو سـەربـــڕاوە
ئاشـــتی گـــۆرانی داوە گـەلانـــی پـــێ ڕاوکـــراوە
لۆمـــەی ڕۆژئـــاوا نـاکـــەم لـــەو تـەڵانـــەی داینـــاوە
داخـم لـەو گەلـە گەمژەیـە وا ئاسـان پـێ ی خەڵـەتاوە

* * *

بیـــری ڕۆژئـــاوا دەردە وەك تـــاعوونی هـــەناوە
تـــەنها لـــەلای ئیـــسلامە چـــی چارەســـەری شـــیاوە
مـــــژدەت لێ بـــێ ڕۆژئـــاوا ڕۆژت وا لـــــەڕۆژئاوا
گـــەر بـــڕوات نیـــە بپرســـە لـەوگـــەلانەی فـەوتـــاوە

* * *

گـەلانی عـادو ثـەمـود هەسـت و خوسـتیان لێ مـاوە ؟
ئـــەی بـــۆ پرســـیارێ ناکـــەی لەوفیرعەونـــەی خنکـــاوە
یـــاخود ئـــا لـــەو قاروونـــەی بـــەناخی زەوی بـــردراوە
چـــاوەڕێ کـــەن چـاوەڕێین بڕیـــاری خـــوا هـــەر مـــاوە

* * *

ڕووی ڕاســــتەقینەت ڕێویـــــەکی ڕیـــــسوایە
ڕۆژی نەمانــــــت ڕەوشــــێکــــــی ڕەزایـــــــە

## ناوەرۆك

بگەڕێوە بۆ بنەچەت ، باوە ئادەم، تەوبەکەی
کەر وانەکەی بێ شکە لاسایی ئیبلیس دەکەی
دونیا کورتە بزانە چۆن خودات ڕازی دەکەی
کەر کێلانە بەڕێت کرد لەنێو گۆڕا چی دەکەی ؟

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر